# تاوانە گەورەکان

نووسینی

ئیمامی زەهەبیی

وەرگێڕانی

عَبَّاس محمّد أمین





# تاوانە گەورەکان

نووسینی

ئیمامی زەهەبیی

کۆچکردووی ساڵی ٧٤٨ ک

تحقيق

عبدالغني عبد الغفار زايد

وەرگێڕ

عباس محمد امين

| | |
|---|---|
| نـــاوی کتێـــــــب: | تاوانە گەورەکان |
| نووسیـــنـــــــــی: | ئیمامی زەهەبی |
| نـەخشەسازی ناوەوە: | کۆمپیوتەر (کامران رفیق) |
| ســـاڵی چـــــاپ: | ٢٠١٥ ز |
| ژمـــــارەی سپــاردن: | (٧٦٢) ی ساڵی (٢٠١٤) ی پێدراوە. |

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

## پێشەکی وەرگێڕ

لە ڕاستیدا کتێبی ( الکبائر ) تاوانە گەورەکان کە ئێستا لە بەردەستمدایە بۆ وەرگێڕان بە زمانی شیرینی کوردی، کتێبێکی پەسەند کراوە لای سەرجەم زانایانی ئیسلام، تا ئەمڕۆ کەسێك توانجی لێ نەگرتووە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بە توانایی خاوەنەکەی کە ئیمامی زەهەبییە. هەر بۆیە بڕیارم دا بە پشتیوانی خوای گەورە ئەم کتێبە وەربگێڕم.

گرنگترین کارەکانم لەم وەرگێڕانەدا:-

١-گەڕانەوەی سەرجەم ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بۆ هەمان فۆنت کە لە قورئاندا نووسراوە (( مصحف المدینة )).

٢- هەوڵمداوە فەرموودە شیرینەکان بە گوێرەی پێویست سەرو ژێری بۆ بکەم، بۆ ئەوەی خوێنەری خۆشەویست بە ڕەوانی بیخوێنێتەوە .

٣- هەوڵمداوە سوود لە (صەحیحی) بوخاری وەربگرم کە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ئەمەش بۆ ئەوەی زیاتر خوێنەر سوودی لێ وەربگرێت.

٤- لە ڕاڤەی ئایەتەکانی قورئاندا زیاتر سوودم لە تەفسیری ئاسان وەرگرتووە .

٥- هەروەها بەدواداچوونم بۆ ئەو فەرموودانە کردووە کە لێکۆڵەر پاڵفتەی کردووە، دیارە هەمووی لە جێگەی خۆیەتی و هیچ گرفتێکیان نیە و ڕاست و درووستن.

لە کۆتاییدا ئەوەی کە پێکاومانە لە لایەن خواوەیە وە ئەوەی کە هەڵەو پەڵەیە لە لایەن ئێمەوەیە، پاکی و بێگەردی هەر بۆ خوای گەورەیە .

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

## پێشەکی لێکۆڵەر

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانییان، ئەنجام و کۆتایی تەنها بۆ لەخوا ترساوانە، دوژمنایەتیش تەنها بۆ ستەمکارانە، شاهیدی دەدەم کە هیچ کەس شایستەی پەرستن نیە جگە لە خودای تاك و تەنها و بێ هاوەڵ و بێ هاوتایە، شاهیدی دەدەم کە محمد بەندەو پێغەمبەری خودایە، نێردراوە بە کتێبێکی ڕوون و ئاشکرا، کە جیاکەرەوەیە لە نیوان حەق و ناحەق، گومان و ڕاستی ، ڕێنومایی و گومڕاییدا .

پاشان:

لە ڕاستیدا کتێبی تاوانەگەورەکان (الکبائر) سوودمەندە بۆ وتاربێژان و ئامۆژگاریکەران، ئاگەدارکردنەوەیەکە بۆ بێ ئاگایان و دوودڵان، سەرکۆنەکردنە بۆ سەرپێچیکەران و لە سنوور دەرچووان، ڕێنیشاندەرە بۆ خوو ڕەوشتی جوان و بەرز ڕاگرتنی، بەتایبەت خاوەنی ئەم کتێبە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، چارەسەری هەندێ بابەتی تیدا کردووە کە سوودمەندە بۆ دنیاو دواڕۆژیان، قسەی لەسەر هەندێ بابەت کردووە کە تێگەشتن لێی گرانە لە کتیبە زانستی و بابەتیەکاندا بە تایبەت بۆ زانا و خوێندکاران بەگشتی.

لەگەڵ ئەوەی ئەم کتێبە خاوەن پلەو پێگەیەکی بەرز و گەورەیە، بەڵام خاوەنەکەی( ڕەحمەتی خوای لێ بێت) هەندێ چیرۆك و گێرانەوە و فەرموودەی لاوازو بەڵکو هەڵبەستراوی تێدا باسکردووە، سەرەڕای ئەوەی کە بابەتەکانی نایابەو بەڵگەکانی قورئان و فەرموودە ڕاستەکان زۆر لە جێگەی خۆیەتی.

هەر بۆیە داوام کرد لە کۆمپانیای (شروق) بۆ ڕاستکردنەوە و پاڵفتەکردنی کتێبی( الکبائر) بۆ چارەسەری عەیبەکانی، وەك لابردنی فەرموودە لاوازو هەڵبەستراوەکانو هێشتنەوەی فەرموودە ڕاست و دروستەکان، هەر بۆیە ناومان نا بە ( صحیح تهذیب الکبائر) .

داواکارم لە خوای گەورە بیکاتە مایەی سوودو قازانج، تەنها پشت بە ئەو دەبەستین و باشترین پەناگەمانە.

لێکۆڵەر

ژیاننامەی نووسەر

**یەکەم: ناوی و ڕەچەڵەکی:**

(شمس الدین) (محمد) ی کوڕی (أحمد) کوڕی عوسمان کوڕی قایماز کوری عبد الله ی تورکمانی نەژادی فارقی، دیمەشقی، زەهەبییە.

**دووەم: لەدایك بوونی:**

لە (میافارقین) لە دیمەشق لە دایك بووە لە مانگی ڕەبیعی ئەوەڵی ساڵی(٦٧٣ ك – ١٢٧٤ز).

**سێیەم: مامۆستاکانی:**

ئیمامی زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) مامۆستای زۆر بووە لەوانە(أبو العباس العامري – أحمد عبد القادر( ت: ٦٧٣ك )، ابن الصابوني (ت: ٦٨٠ك )، أمين الدين ابن عساكر (ت: ٦٨٧ك )، ئەمانە هەموویان نیشتەجێی دیمەشق بوون، لە شاری ( حلب ):( أحمد بن محمد بن النصيبي (ت: ٦٩٢ك )، لە (مكة) :محي الدين الطبري(ت: ٦٩٤ك )، لە مەدینە: كافور بن عبد الله الطواشي، لە ئەسکەندەرییە: علي بن أحمد بن عبد المحسن الهاشمي الحسيني الواسطي الغرافي(ت: ٧٠٤ك ) .

**چوارەم: خوێندکارەکانی:**

لە ڕاستیدا ئەوانەی زانستیان لە ئیمامی زەهەبی وەرگرتووە زۆر بوون، لەوانە( البرزالي، العلائي، ابن كثير، ابن رافع، ابن رجب)و کەسانێکی زۆری تر.

**پێنجەم: وەسف و پیاهەڵدانی زانایان:**

ئیمامی (الصفدي ) خوێندکاری خۆی دەربارەی دەڵێت: ئیمامی زەهەبی بیرمەندێکە نکوڵی لێ ناکرێت، زانایە لە زانستی فەرموودە و پیاوەکانی، زۆر بەچاکی ژیاننامەیان دەزانێت، تەم و مژی لەسەر مێژوویان هەڵداوەتەوە،بیرو هۆش و زیرەکیی لە ڕادە بەدەر بووە، وە ( تاج الدين السبكي): دەربارەی دەڵێت: مامۆستامانەو پێشەوامانە، پێشەواو (حافظ)، فەرمودەناسی سەردەم.

هەروەها یەکێکی تر لە خوێندکارەکانی (الحسيني) (٧٦٥ك مردووە) دەڵێت: پێشەواو ڕابەرو مێژوو نووسی فەرمودەناسانی شام.

**شەشەم:** پیشەوا زەهەبی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) سەروەتێکی زۆری بۆمان جێهێشتووە لە بواری نووسیندا کە دونیای پڕ کردووە لە زانست و زانیاری، هەندێ لەوانە: تاريخ الإسلام الكبير، ميزان الإعتدال في نقد الرجال، طبقات الحفاظ، تجريد الأصول في أحاديث الرسول، الإعلام بوفيات الأعلام، الرخصة في الغناء والطرب بشرطه،الضعفاء، ذيل الضعفاء، الكبائر، ئەوەی ئیستە لەبەردەستدایە، مختصر تهذيب الكمال للمزي، مختصر سنن البيهقي، سير أعلام النبلاء، العبر، ذيل تاريخ الإسلام، الطب النبوي، مختصر دول الإسلام، جگە لەمانە زۆرێکی تریش.

**حەوتەم: کۆچی دوایی:**

پێشەوا ئیمامی زەهەبی (رەحمەتی خوای لێ بێت) لە ڕۆژی سێیەم لە مانگی (ذی القعدة) (ك٧٤٨ – ١٣٤٨ ك) کۆچی دوایی کردووە،لە گۆڕستانی ( الباب الصغير ) لە دیمەشق(١) نێژراوە.

## کاری من لەم کتێبەدا

١-هەموو دەقەکانی قورئانم گێڕاوەتەوە بۆ ژمارەو سورەتەکان ئەوەش لە دەقی کتێبەکەدا .

٢-هەموو فەرموودە ڕاستەکانم داوەتە پاڵ ئەو کەسانەی کە گێڕاویانەتەوە .

٣- هەرچی فەرموودەی لاوازو هەڵبەستراو هەیە لام بردووە.

٤-ئەگەر فەرموودەکە لە دەرەوەی بوخاری و موسلیم بێت، حوکمی زانایانم لەسەری هێناوە .

٥-هەموو ئەو وشانەی کە نامۆیە لە خوارەوە ڕوونم کردۆتەوە .

داواکارم خوای گەورە بیکاتە مایەی سوود و قازانج،هەروەها بیخاتە سەر تەرازووی کارە باشەکانمان لە ڕۆژێکدا کەماڵ و منداڵ قازانجی نیە جگە لەو کەسە نەبێت کە بەدڵێکی پاکەوە بچێتە خزمەتی خوای گەورە .

لێکۆڵەرەوە

الشیخ \ السید عبد الغني زاید

ئیمام و وتاربێژو مامۆستا

محقق للتراث الإسلامي

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خوای جیهانییان، دوژمنایەتی تەنها بۆ ستەمكارانە، دروودو وسەلام لەسەر پێشەوامان محمدﷺ پێشەوای پێغەمبەران و لە خواترسان، لەسەر یارو یاوەرانی تا ڕۆژی دوایی .

پاشان:

ئەم كتێبە بەشێوەیەكی گشتی باسی تاوانە گەورەكان و قەدەغەكراوەكان لەخۆ دەگرێت، خوای گەورە لە كتێبەكەیدا گرەنتی داوە بەو كەسەی كە خۆی دەپارێزێت لە تاوانە گەورەكان ئەوا لە تاوانە بچوكەكانی خۆش بێت، وەك دەفەرموێت:﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾(النساء: ٣١) . واتە: ئەگەرخۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی قەدەغە كراوە، ئەوە لە گوناهەكانی ترتان چاو پۆشی دەكەین و دەتانخەینە جێیەكی خۆش و سازگارو ڕێزدارەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴾ (الشورى: ٣٧). واتە: ئەوانەی خۆیان لە گوناهی گەورەو تاوانی خراپ و ناشرین دەپارێزن، كاتێك كە تووڕە دەبن (لەسەر هەڵەیەك كە بەرامبەریان دەكرێت) هەر ئەمان چاو پۆشی دەكەن و لێدەبوورن...

هەروەها دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ ﴾ (النجم: ٣٢). واتە: ئەوانەی كە خۆیان دەپارێزن لە گوناهو تاوانە گەورەكان لە گوفتارو كرداری بەد جگە لە وردە گوناهان، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ، ئەی ئیماندار چاوپۆشی زۆر فراوانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت(الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ وَالْجُمْعَةُ إلى الْجُمْعَةِ وَرَمَضَانُ إلى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ ما بَيْنَهُنَّ إذا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ)[1] .

واته: پێنج فەرزەی نوێژ، هەینی بۆ هەینی، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، دەبنه كەفارەتی تاوانەكان بەمەرجێ دوور بێت له تاوانه گەورەكان.

لێرەدا وا پێویسته لێكۆلینەوه له تاوانه گەورەكان بكەین بۆ ئەوەی موسڵمانان لێی به دوور بن، زانایانی ئیسلام دەربارەی تاوانه گەورەكان ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیه:

وتراوه: تاوانه گەورەكان بریتین له حەوت دانه، بەڵگەیان ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ ه كه له(أبو هريره) وه – ڕەزای خوای لێ بێت – دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی:(اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ) قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ وما هُنَّ؟ قال: الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ التي حَرَّمَ الله إلا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يوم الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلَاتِ):

واته: (خۆتان لەو حەوت شته بپارێزن كه لەناوبەرن) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانه چین؟ فەرمووی: هاوەڵ بۆخوا پەیدا كردن، سیحرو جادووكردن، كوشتنی كەسێك كه خوای گەوره قەدەغەی كردووه ئیللا به حەق وڕاستی نەبێ، خواردنی ڕیبا، خواردنی ماڵی هەتیو، پشت هەڵكردن له كاتی جەنگدا، تۆمەتباركردنی ئافرەتانی ئیماندارو داوێن پاك و بێ ئاگا.

(ابن عباس) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: تاوانەگەورەكان نزیك دەبێتەوه له حەفتا دانه، نەك حەوت دانه، هەركەسێك یەكێك لەم تاوانه گەورانه ئەنجام بدات كه له دونیادا سزای بۆ دیاری كراوه ئەمەش وەك: كوشتن، زینا كردن، دزیكردن،یا ئەو تاوانه خاوەنەكەی به سزادان و تووڕەیی هەڕەشەی لێ كراوه له ڕۆژی دواییدا، یا بەر نەفرین(لعن) دەكەوێت لەسەر زمانی پێغەمبەر محمدﷺ ئەمانه هەموویان به تاوانی گەوره

[1] – مسلم(٢٣٣) .

دەژمێردرێن،پێویستە بزانین کە هەندێ تاوانی گەورە هەن لە هەندێکی تر گەورەترن، ئایا نەتبینیوە کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵ پەیداکردن (شرك) ی بە گەورەترینی تاوانە گەورەکان لە قەڵەم داوە، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنەکەی بە هەتا هەتایی لە ناو دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بەهیچ شێوەیەك لێی نابوردرێت .

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ (النساء: ٤٨) واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت.

# تـاوانی یەكەم
## هاوەڵ و شەریك دانـان بۆ خوای گەورە

بێگومان گەورە ترین تاوان: هاوەڵ پەیداكردنە بۆ خوای گەورە ئەوەش دوو جۆرە:

**یەكەم**: لە گەڵ خوادا شتێك هاوچەشن و هاوتا بكرێتەوە لە یەكتاپەرستیدا، لە: دار، یا بەرد، یا خۆر، یا مانگ، یا پیاو چاك، یا ئەستێرە، یا فریشتە،یا هەرشتێكی تر جگە لەمانە، ئەمە بەڕاستی هاوەڵ پەیداكردنی گەورەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ (النساء:٤٨، ١١٦ ). واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێكی تر ببەوێت خۆش دەبێت.

خوا گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ (لقمان:١٣). واتە: بەڕاستی هاوتاو هاوبەش بڕیاردان ستەمێكی زۆر گەورەو ناڕەوایە.

خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴾ (المائدة:٧٢)، واتە: دڵنیابن ئەوەی شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لێ حەرام كردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە.

هەركەسێك هاوەڵ بۆ خودا پەیدا بكات پاشان بەو شێوەیە مرد، ئەوە لە هاوەڵانی دۆزەخە بە بێ نكوڵی، وەك چۆن هەركەسێك لەسەر یەكتاپەرستی بمرێت ئەوە لەهاوەڵانی بەهەشتە، تەنانەت ئەگەر لەدۆزەخیشدا سزا بدرێت، لە فەرمودەی ڕاست و (صەحیحدا) هاتووە كە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: ( ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلَاثًا ؟ قالوا: بَلَى يا رَسُولَ اللَّهِ، قال: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَجَلَسَ وكان مُتَّكِئًا فقال: ألا وَقَوْلُ الزُّورِ، قال:

فما زَالَ يُكَرِّرُهَا حتى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ [١]. واته: پێغەمبەری خوا سێ جار فەرمووی: ئایا هەوالّتان پێ بدەم گەورەترینی گوناهەكان كامەیە؟ سێ جار (لەسەر یەك ئەمەی فەرموو) وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: هاوەڵ و شەریك بڕیاردان بۆ خوای گەورە، سەرپێچی كردنی دایك و باوك) پاشان دانیشت پێشتر شانی دادابوو. فەرمووی: شایەتی ناهەق، هەر بەردەوام دووبارەی دەكردەوە تاوەكو وتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو

**جۆری دووەم: ڕیایی كردنە بە كردار:**

وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا﴾ (الكهف: ١١٠)، واته: جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد بێت، با كارو كردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەك لە پەرستنیدا هیچ كەسێك نەكاتە هاوەڵ و شەریك.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إيَّاكُم وَالشِّرْكُ الأصْغَرُ، قالوا: يا رَسُولَ اللَّه وما الشِّرْكُ الأصْغَرُ؟ قال: الرِّيَاءُ، يَقُولُ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يوم يُجَازَى الْعِبَادُ بِأَعْمَالِهِمُ اذْهَبُوا إلى الَّذِينَ كُنْتُمْ تراؤون بِأَعْمَالِكُمْ فِي الدُّنْيَا انْظُرُوا هل تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً) [١]

واته: خۆتان بپارێزن لە هاوەڵ پەیداكردنی بچوك، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا هاوەڵ پەیداكردنی بچووك چیە؟ فەرمووی: ڕیایە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا كە پاداشتی بەندەكانی دەداتەوە، دەفەرمووێت بڕۆن بۆ لای ئەوكەسانەی كە بە كردارەكانتان ڕیاتان بۆ دەكردن، بزانن هیچ پاداشتان لایان دەست دەكەوێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای گەورە دەفەرمووێت: (من عَمِلَ عَمَلًا أشْرَكَ مَعِي فيه غَيْرِي، فَهُوَ لِلذي أشْرَكَ وَأنَا مِنْهُ بَرِيء ).واته: پێغەمبەر ﷺفەرموویەتی:( خوای گەورە

---

١ – البخاري(٢٦٥٤)، ومسلم(٨٧).

١ – أحمد( ٥ \ ٤٢٨، ٤٢٩ )، وقال الهيثمي في المجمع(١ \ ١٠٢): رجاله رجال الثقات.

دەفەرموێت: هەرکەسێك کردارێك ئەنجام بدات جگە لە من کەسێکی تر بەشداری پێ بکات، ئەوە ئەو کارەی هەر بۆ ئەو ئەنجامداوە و من لێی بەریم )

هەروەها فەرموویەتی: (من سَمَّعَ سَمَّعَ اللهُ بِهِ وَمَنْ يرائى يرائى الله بِهِ)[1]. واتە: ئەوەی کردارێك ئەنجام بدات بە ڕیا بیدات بە گوێی خەڵکیدا، خوا ڕیسوای دەکات و ناوەڕۆکی ئاشکرا دەکات، هەرکەسێکیش کارێ بکات مەبەستی بۆ خوا نەبێت، بە نیەتی خۆی لەگەڵ دەکات..

لە (أبو هريرة) وە -ڕەزای خوای لێ بێت-، پێغەمبەرﷺفەرموویەتی:(رُبَّ صَائِمٍ ليس له من صِيَامِهِ إلا الْجُوعُ وَرُبَّ قَائِمٍ ليس له من قِيَامِهِ إلا السَّهَرُ)[2]. واتە: هەندێ لە ڕۆژوو گران هەیە هیچی دەست ناکەوێت جگە لە برسێتی و تینوێتی نەبێ، وە هەندی لەو کەسانەی کە شەونوێژ دەکەن جگە لە شەو نخوونی نەبێت هیچیان دەست ناکەوێت .

ئەمە مانای ئەوەیە ،هەرکەسێك نوێژ و ڕۆژوی بۆ خوا نەبێ پاداشتی دەست ناکەوێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَـٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾(الفرقان: ٢٣ )، واتە: ئەو کردەوانەی کردبوویان لەپێناو غەیری خوادا پاداشتەکانمان پووچکردەوە و کردمان بە تەپ و تۆزێکی پەرش و بڵاو.

پرسیار کرا لە دانایەك: دڵسۆز کێیە؟ وتی: دڵسۆز ئەو کەسەیە کە کردەوە چاکەکانی دەشارێتەوە وەك چۆن کردەوە ناشرینەکانی دەشارێتەوە .

وە (فضيل بن عياض ) - ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: (وازهێنان لە کار و کردەوە لەبەر خەڵك ڕیایە، کارکردن لەبەر خەڵك هاوەڵ پەیدا کردنە (شرك)، دڵسۆزی ئەوەیە کە خوای گەورە لەو دووانە بتپارێزێت ) .

---

[1] - البخاري( ٦٤٢٩)، ومسلم(٢٩٨٧) .

[2] - أحمد( ٢ \ ٣٧٢)، وابن حبان ( ٥٦٤ موارد )

# تاوانی دووەم

## کوشتنی کەسێك

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُ جَهَنَّمُ خَالِدًا فِيهَا وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُ وَأَعَدَّ لَهُ عَذَابًا عَظِيمًا ﴾ (النساء: ٩٣). واتە: هەرکەسێك بەدەستی ئەنقەست ئیمانداریك بکوژێت، ئەوە تۆڵەی ئەوکەسە دۆزەخە، نەمرە تیایدا، هەروەها خوا لێی توڕە بووە و نەفرینی لێکردووە و سزایەکی گەورە و بێ سنووری بۆ ئامادە کردووە.

وە دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴾ (**الفرقان: ٦٨** ) . واتە: هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بەحەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات ئەوە تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا ﴾ (**المائدة: ٣٢** ) واتە: لەبەر ئەوەی کارەساتی کوشتنی ناڕەوای ئاوا ڕوو نەدات ئێمە پێویستمان کرد لەسەر نەوەی ئیسرائیل ئەوەی کەسێك بە ناحەق بکوژێت و لە جیاتی کوژراوێك نەبێت، یان گوناهو تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لە زەویدا( وەکو جەردەیی و دەستدرێژی و ..... هتد ) ئەوە وەك ئەوە وایە هەر هەموو خەڵکی کوشتبێت.

هەروەها دەفەرموێت: (قَالَ ﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴾ ( **التكوير: ٨، ٩** ) .واتە: کاتێك کچی زیندە بەچاڵکراو پرسیاری لێدەکرێت. بە چ گوناهێك، بە چ تۆمەتێك کوژرا؟!

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆتان لەو حەوت تاوانە بپارێزن، یەکێك لەوانە: کوشتنی کەسێکە کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە ئیللا بە حەق و ڕاستی نەبێت .

پیاوێك بە پێغەمبەری خوای وت: چ تاوانێك لای خوای گەورە زۆر گەورەیە؟ ئەویش فەرمووی: (أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وهو خَلَقَكَ). واتە لەگەڵ خوادا شتێك هاوتا بکەیتەوە لە پەرستندا لەگەڵ ئەوەدا خوای گەورە دروستی کردووی )). وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ) منداڵەکەت بکوژیت لەترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات )) وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ) زینا لەگەڵ دراوسێکەتدا بکەیت )) خوای گەورە بۆ پشت ڕاست کردنەوەی ئەم فەرموودەیە ئەم دەقەی دابەزاند: ( ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴾ ( **الفرقان: ٦٨** ) . واتە: هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بەحەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات ئەوە تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت.

پیغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( إذا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ) قيل: يا رَسُولَ اللَّهِ هذا الْقَاتِلُ، فما بَالُ الْمَقْتُولِ ؟ قال (إنه كان حَرِيصًا على قَتْلِ صَاحِبِهِ). واتە: ( ئەگەر دوو موسڵمان بەشمشێرەکەیان لەگەڵ یەکتر بەشەڕهاتن ئەوە بکوژو کوژراو بۆ دۆزەخ دەچن ) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە بکوژە، ئەی کوژراو بۆ ؟ فەرمووی: ( بێگومان ئەویش سوور بوو لەسەر کوشتنی هاوڕێیەکەی ).

(أبو سليمان الخطابي) دەڵی ئەمە بەو شێوەیە دەبێت ئەگەر هەردوولا یەکتر نەکوژن بەهۆی لێکدانەوە (تأويل)، بەڵکو لەسەر دوژمنایەتییەك شەڕ بکەن کە سەرچاوەکەی بگەڕێتەوە بۆ هۆزایەتی یا ناوچەگەری، یا لەبەر دونیا، یا دەسەلآت و پلەو پایە، یا پارەو و سامان، بەلآم ئەوەی شەڕی لەسنوور دەرچووەکان (أهل البغي) دەکات بەمەرجێك لەسەر ئەو سیفەتە بێت کە دەبێت کوشتاریان لەگەڵ بکرێت، یا بەرگری لە خۆی، یا نامووس و شەرەف بکات، ئەمانە بەهیچ شێوەیەك ناچنە ئەو چوار چێوەیە، چونکە ئەمە شەڕ دەکات بۆ ئەوەی گیانی خۆی بپارێزێت و هیچ مەبەستێکی تری نیە بۆ لەناوبردنی هاوڕێکەی، ئەوەی کە شەڕ لەگەڵ لە سنوور دەرچووەکان یا چەتەو دزەکان دەکات سوور نیە لەسەر کوشتنیان، بەڵکو دەیەوێت لەخۆی دووریان بخاتەوە، خۆ ئەگەر هێرشبەرەکە وازی هێنا ئەمیش وازی لێ دەهێنێت و شوێنی ناکەوێت، بێگومان ئەم فەرموودە بۆ خاوەن ئەم سیفەتانە نەهاتووە، بەلآم ئەوەی لەم چوارچێوەیە دەرچوو ئەوە هەڕەشەی ئەو فەرموودەیە دەیگرێتەوە کە ئێستە لەخزمەتیداین، خوا زانا ترە .

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:(لَا تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ)[1]. واتە: دوای من مەبن بە کافر، هەندێکتان بدەن لە گەردنی ئەوی ترتان.

هەروەها فەرموویەتی:(لا يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ من دِينِهِ ما لم يُصِبْ دَمًا حَرَامًا). واتە: بەردەوام مرۆڤی باوەڕدار لەناو فراوانی ئاینەکەیدایە بەمەرجێك خوێنی کەسێکی بەحەرامی نەڕشتبێ .

هەروەها فەرموویەتی: (أَوَّلُ ما يُقْضَى بين الناس يوم القيامة في الدِّمَاء).

واتە: یەکەم دادوەری لە نێوان بەندەکاندا کە دەکرێت لە ڕۆژی دواییدا دەربارەی خوێن ڕشتنە.

---

[1] - البخاري( ١٢١)، ومسلم ( ٦٥) .

وە فەرموویەتی:(الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ. واتە: تاوانە گەورەکان: هاوەڵ بۆخوا بڕیاردان، دڵ ئیشانی دایك و باوك، کوشتنی کەسێك، سوێندی درۆ. لەبەر ئەوە ناونراوە بە (الْغَمُوس) چونکە خاوەنەکەی دەخاتە ئاگرەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إلا كان على بن آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ من دَمِهَا وَذَلِكَ لِأَنَّهُ أَوَّلُ من سَنَّ الْقَتْلَ )[٥]. واتە: هیچ کەسێك بە ناحەق ناکوژرێت ئیللا نەوەی یەکەمی ئادەم پشکێکی بەر دەکەوێت، چونکە ئەوە یەکەم کەس بوو ڕێبازی کوشتنی داهێنا.

هەروەها فەرموویەتی: (من قَتَلَ مُعَاهَدًا لم يَرِحْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ وَإِنَّ رِيحَهَا تُوجَدُ من مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ عَامًا ). واتە: هەرکەسێك پەیمان بەستێك بکوژێت بۆنی بەهەشت ناکات، بێگومان بۆنی بەهەشت دووری چل ساڵ هەستی پێ دەکرێت.

ئەمە ئەگەر کەسێك پەیمان بەستێك بکوژێت، وەك ئەوەی کە پەیمانی داوە لە جولەکەو گاور لە وڵاتی ئیسلامدا – ئەی کوشتنی موسڵمانێك دەبێ چۆن بێت.

[٥] – البخاري:( ٣٣٣٥).

# تاوانی سێ یەم

## جادوو ( السحر )

بێگومان جادووزان بێ باوەڕە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴾ ( البقرة: ١٠٢ ) . واتە: هەرگیز سولەیمان کافر نەبووە، بەڵکو شەیتانەکان کافر بوون و خەڵکیان فێری سیحر و جادوو کردووە.

شەیتانە نەفرەت لێکراوەکان هیچ شتێکیان لە مرۆڤەکان ناوێت جگە ئەوە نەبێ کە بێ باوەڕیان بکەن و هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدەن، خوای گەورە دەربارەی هاروت و ماروت دەفەرموێت: ((وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴾ ( البقرة:١٠٢ ). واتە: ئەوانیش کەسیان فێری هیچ شتێك نەدەکرد تا پێیان نەوتایە: ئەم کارەی ئێمە بۆ تاقیکردنەوەیە و خۆت کافر مەکە( کەچی هەندێك هەر کۆڵیان نەدا ) لەو فریشتانەوە شت وا فێردەبوون کە ژن و مێردی پێ لەیەك جوودا بکەن،( هەرچەندە ) ئەو جادووگەرانە ناتوانن هیچ زیانێك بەکەس بگەیەنن،مەگەر ویستی خوای لەسەر بێت، ئەو خەڵکە سەرگەردانە هەمیشە فێری شتێك دەبن کە زیانیان لێ دەداو سوودی نیە بۆیان، بێگومان دەشزانن ئەوەی کاڵای وای کڕی بێت و شتی وا فێر ببێت لەو دونیا هیچ بەهرەیەکی دەست ناکەوێت.

خەڵکێکی زۆر دەبینی لە گومڕاکەران دەچنە ناو سیحر و جادووەوە تەنها وا گومان دەبەن کە حەرام و قەدەغەیە، هەست ناکەن ئەو کارە بێ باوەڕییە، بۆیە دەست

وەردەدەنە کارو باری ژن و مێردەوە ئەو کارەش جادووە، بۆ خۆشەویستی پیاو بۆ ئافرەت و ڕق بوونەوە لێی، هاوشێوەی ئەمانەش بە چەند وشەیەکی نادیار و بێ مانا کە زۆربەی شیرك و گومڕاییە .

سزای جادووکەر: کوشتنە، چونکە بێ باوەڕی دەکا بەخوا، یا هاوشێوەی بێ باوەڕییە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( خۆتان لە حەوت تاوانە گەورەکە بپارێزن ) یەکێك لەوانەی کە باسی کردووە جادووکردنە .

پێویستە مرۆڤی بڕوادار لە خوا بترسێت و کاریٚ نەکات دنیاو دوارۆژی لەدەست بدات.

لە (بجالة بن عبدة ) وە وتی: ئیمامی (عمر )- ڕەزای خوای لیٚ بێت - ساڵیٚ پێش مردنی هات بۆ لامان، وتی: هەموو جادووکەرێکی ژن وپیاو بکوژن.

لە ( ابن مسعود ) وە - ڕەزای خوای لیٚ بێت – بە (مرفوع ) ییەوە هاتووە کە دەڵێت:(إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ وَالتِّوَلَةَ شِرْكٌ)[1] .

التمائم: کۆی (تميمة)ەیە، بریتیە لە کۆمەڵە مووروویەك نەفامەکان هەڵیدەواسن بە خۆیان و منداڵ و ئاژەڵەکانیان، بڕوایان وایە کە ئەمە لە چاوی پیس دەیانپارێزێت، بەڕاستی ئەمە کاری نەفامە ئەوەی ئەم کارە بکات ئەوە هاوەڵی بۆ خوا پەیدا کردووە .

التِوَلَةُ: جۆرێکە لە جادوو، بریتیە لە خۆشەویست کردنی ئافرەت لای پیاوەکەی، ئەمەش بە هاوەڵ پەیداکردن هەژمار دەکرێت، لەبەر ئەوە نەفامەکان بڕوایان وایە ئەوە کاریگەری هەیە بە پێچەوانەی ئەوەی کە خوا بڕیاری لەسەر ئەدات.

(الخطابي) - ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت – دەڵێت: بەلاٚم ئەگەر نووشتە (الرقية) بە قورئان بێت، یا بە یەکێك لە ناوەکانی خوای گەورە ئەوە ئاساییە، چونکە پێغەمبەرﷺ نوشتەی بۆ حسن و حسێن کردووە و فەرموویەتی: (أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَّةِ من كل

---

١ - الرقي: نووشتە

شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كل عَيْنٍ لَامَّةٍ)(٢). واته :داوادەكەم له خواى گەورە بتانپارێزێت بەناوە پيرۆزەكانى خۆى،له هەموو شەيتانێكى ژەهراوى، وە له هەموو چاوێك كه مرۆڤ توشى شلەژان و شێت بوون دەكات.

# تـاوانی چوارەم

# نوێژ نەكردن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴾ (مريم: ٥٩). واته: له دوای ئەوان كەسانێك له نەوەكانیان بوونه جێنشین، كه نوێژەكانیان به زایه داو شوێنی ئارەزووەكانی نەفسیان كەوتن،ئەوانه تووشی گومڕایی و سەرگەردانی و سزا دەبن( له دونیاو قیامەتدا )

( ابن عباس ) دەفەرموێت:( واتای ئەوە نیه كه بەگشتی وازیان له نوێژ هێناوە، بەلاّم ئەوەیه كه لەكاتی خۆیدا دوای دەخەن.

خوای گەورە له ئایەتێك دەفەرموێت: ﴿ فَوَيۡلٌ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴾(الماعون: ٤، ٥). واته: جا هاوارو واوەیلیّ بۆ نوێژكەرانێك....ئەو نوێژكەرانەی گویّ نادەن به نوێژەكانیان و كاریگەری نیه لەسەریان و دلّی نادەنیّ و لێی غافلّن....

وه له ئایەتێكی تردا دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُلۡهِكُمۡ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾( المنافقون: ٩). واته: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە، هەولّ بدەن نه مالّ وسامانتان، نه ڕۆلّەكانتان،نەبنه هۆی ئەوەی كه له یادی وخواو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو كەمتەرخەمی و بیّ ئاگاتان بكەن،جا هەر كەس له یادی خوا كەمتەرخەمی بكات، ئائەوانه هەر خۆیان خەسارەت مەندو و زەرەر مەندن.

ڕاڤەزانان دەفەرموون: وشەی( ذِكۡرِ ٱللَّهِ ) لەم ئایەتە پێنج فەرزەی نوێژ دەگەیەنێت، هەركەسێك بەهۆی ماڵ و سامان و كڕین و فرۆشتن و ژیانەوە نوێژەكانی دوا بخات ئەوە لە زەرەر مەندانە .

خوای گەورە دەربارەی ئەهلی دۆزەخ دەفەرموێت: ﴿ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾ فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴾(المدثر: ٤٢ – ٤٨) .واتە: ئەوە چی بوو ئێوەی ڕاپێچی دۆزەخ كرد؟! بە كەساسیەوە دەڵێن: ئێمە لە نوێژكەران نەبووین.... خۆراكمان بە هەژاران نەدەبەخشی... ئێمە لەگەڵ دەم درێژو بێ ئابڕووەكاندا قسەی خۆمان دەكردو لە بابەتی ئەوانمان دەگوت و ڕەخنەی بێ جێمان دەگرت و لەگەڵیان ڕۆ دەچووین. ئێمە بڕوامان بە ڕۆژی پاداشت نەبوو. هەتا مردن یەخەی پێ گرتین و تەمەنمان كۆتایی هات.كەواتە ئیتر تكای تكاكاران سوودیان پێ ناگەیەنێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( بين الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلَاةِ).

واتە: نێوانی كەسێك و بێ باوەڕ وازهێنانە لە نوێژ .

لە (صەحیحی) بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من ترك صلاة العصر حبط عمله )[٢]. واتە: هەركەسێك نوێژی عەسر واز لێ بهێنێت كردەوەكەی بەتاڵ دەبێتەوە

هەروەها ﷺ فەرموویەتی: ( أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ الناس حتى يَقولوا: أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللَّه، وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فإذا فَعَلُوا ذلك عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إلا بِحَقِّ الْإِسْلَامِ وَحِسَابُهُمْ على اللَّه)[٣].

واتە: فەرمانم پێ كراوە لەگەڵ خەڵكدا بجەنگم هەتا دەڵێن: هیچ كەس شایەنی پەرستن نیە جگە لە خوای تاقانە، محمد پێغەمبەری خوایە، نوێژەكانیان دەكەن ، زەكاتی

---

[٢] – البخاري(٥٥٣).

[٣] – البخاري( ٢٥ )، ومسلم (٢٢).

ماڵەکانیان دەدەن، ئەگەر ئەوانەیان ئەنجامدا، ئەوە خوێن و ماڵیان لە من حەرام دەبێ ئیللا بە حەقی ئیسلام نەبێ و، لێپرسینەوەیان لای خوایە .

ئیمامی (عمر) – ڕەزای خوای لێ بێت – دەڵێت: هەرکەسێك لە ئیسلامدا نوێژ نەکات هیچ مافێکی نیە.

## بەش

## لە چی کاتێکدا منداڵ فەرمانی نوێژکردنی پێ دەکرێت

لە (أبو داود) وە لە (السنن) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلَاةِ إذا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ وإذا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ فَاضْرِبُوهُ عليها). واتە: فەرمان بەمنداڵەکانتان بکەن بۆ نوێژکردن لە حەوت ساڵیدا، ئەگەر گەیشتە دە ساڵ لەسەر نەکردنی ئازاری بدەن .

پێشەوا (ابو سليمان الخطابي) دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لە سەر پێداگیری سزا ئەگەر منداڵەکە پێگەیشتوو بوو (بلوغ) نوێژی نەدەکرد، هەندێ لە هاوەڵەکانی ئیمامی شافعی – ڕەحمەتی خوایان لێبێ- ئەم فەرمودەیە دەکات بە بەڵگە لە سەر کوشتنی ئەگەر بە ئەنقەست نوێژی نەدەکرد دوای تەمەنی پێگەیشتنی(بلوغ)، هەروەها دەڵێت: ئەگەر شایەنی لێدان بوو لە پێش پێگەیشتنی(بلوغ) ئەوا دوای پێگەیشتنی شایەنی سزایەکی گەورەترە جگە لە لێدان،وە لە دوای لێدان هیچ شتێك لە کوشتن گەورەتر نیە.

## بەشێکی تر

## سزای کەسێك پەلە لە نوێژدا دەکات وکڕنووش و سوژدەی ناتەواوە

لە ئیمامی(احمد) لە (ابو مسعود البدری) – ڕەزای خوایان لێبێت- دەڵێت:پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی(لَا تجزيء صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ الرَّجُلُ فيها صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ)[1]. واتە هیچ نوێژێك دروست نیە کە خاوەنەکەی تێیدا پشتی ڕێك نەکات لە کڕنۆش وسووجدە بردندا.

[1] – الترمذي(٢٦٥)، وقال:( صحيح)، وابن ماجه(٨٧٠)، وصححه الشيخ الألباني.

ئەمە دەقێکە لە پێغەمبەرەوەﷺکە هەر کەسێك نوێژ بکات و پشتی ڕاست نەکاتەوە لە کڕنۆش و سوژدەدا ئەوا نوێژەکەی بەتاڵە، ئەمە لە نوێژی فەرزدا، بەوشێوەیە دڵنیابوون(الطمأنينة) لە نوێژدا ئەوەیە کە هەموو ئەندامەکانی جەستە لە شوێنی خۆیدا جێگیر بێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أشد الناس سَرِقَةً الذي يَسْرِقُ من صَلَاَته، قِيلَ: يا رَسُولَ اللَّه وَكَيْفَ يَسْرِقُ من صَلَاَته ؟ قال: لاَ يُتِمُّ رُكُوعَهَا وَلاَ سُجُودَهَا أو قال لاَ يُقِيمُ صُلْبَهُ في الرُّكُوعِ وَالسُّجُود)[٢]. واتە: توندترین کەس لە ناو خەڵکدا ئەو کەسەیە کە دزی لە نوێژەکەی دەکات، وترا: ئەی چۆن دزی لە نوێژەکەیدا دەکا؟ فەرمووی: کڕنۆش و سوژدە و خوێندنەوەی تەواو نیە ).

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :( تِلْكَ صَلَاةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ حتى إذا كانت بين قَرْنَيْ الشَّيْطَانِ قام فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فيها إلا قَلِيلًا ).

واتە: ئەوە نوێژی دووڕووە دادەنیشێت چاودێری خۆر دەکا هەتا دەکەوێتە نێوان دوو شاخی شەیتانەوە(خۆرئاوابوون)هەڵدەستێ بەپەلە چوار رکات نوێژ دەکات یادی خوای تێدا ناکات کەمێك نەبێت.

لە (ابن عباس) وە - ڕەزای خوایان لێبێت- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إذا سجد أحدكم فليضع وجهه وأنفه ويديه على الارض، فإن الله تعالى أوحى إلي أن أسجد على سبعة أعضاء: الجبهة والانف والكفين والركبتين، وصدور القدمين وألا أكف شعرا ولا ثوبا، فمن صلى ولم يعط كل عضو منها حقه لعنه ذلك العضو حتى يفرغ من صلاته).

واتە: ئەگەر هەر یەکێك لە ئێوە سوژدەی برد با نێوچاوان ولووت و هەردوو دەستی بخاتە سەر زەوی، چونکە بە ڕاستی خوای گەورە پەیامی بۆ ناردووم کە سوژدە لەسەر حەوت ئەندام ببەم: نێوچاوان ولووت وهەردوو ناو لەپی دەست، هەردوو ئەژنۆ و، سینگی

[٢] – أحمد(٥ \ ٣١٠)، والدارمي (١٣٢٨).

پێیەکان دەست بۆ قژ و جلەکانم نەبەم، ئەگەر هەرکەسێك نوێژی کرد وماف هەموو ئەندامێك لە ئەندامەکانی نەدا ئەوا ئەو ئەندامە نەفرەتی لێدەکات هەتا ئەو کەسە لە نوێژەکە دەبێتەوە .

وە لە بوخاریەوە لە (حذيفة بن اليمان)ەوە - ڕەزای خوایان لێ بێت- کە ئەو پیاوێکی بینیوە نوێژدەکات و ڕکوع و سوژدەی تەواو نیە، حوزەیفەیش پێی وت: نوێژت نەکردووە، ئەگەر بمری لە سەر ئەو پاکیە نامری کە پێغەمبەری ﷺلەسەر بووە.

## بەشێکی تر
## سزای واز هێنان لە نوێژی بەکۆمەڵ لەگەڵ بوونی تواناداا

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴾ (القلم: ٤٢، ٤٣).

واتە: ڕۆژێك دێت پەردە لەسەر هەموو شتێك لادەبرێت و لاق دەردەکەوێت، خوا نەناسەکان بانگ دەکرێن بۆ سوژدە بردن،بەلاّم ناتوانن.ئەوانە،ئەو ڕۆژە چاویان شۆڕەو زەلیل و خەجاڵەتی بە تەواوی دایان دەگرێت،چونکە کاتی خۆی بانگ ئەکران بۆ نوێژ کردن و سوژدە بردن لە کاتێکدا لەو پەڕی تەندروستی و سەربەستیدا بوون( بەلاّم گاڵتەیان پێ دەهات) .

(ابراهيم التميمي) دەڵێت: مەبەست لە(الى السجود) بۆ نوێژی فەرز .

( سعيد بن المسيب) دەڵێت: مەبەست لەو دەقە ئەوەیە: ئەو کۆمەڵە کاتێك کە گوێیان لە (حي على الصلاة، حي على الفلاح) دەبوو نەدەچوون بەدەم بانگەوە، لەکاتێکدا لەشیان ساغ و سەلامەت بوو .

(كعب الأحبار) دەڵێت: سوێند بەخوا ئەم دەقە دانەبەزیوە ئیللا بۆ ئەوكەسانە نەبێت كە لە نوێژی بەكۆمەڵ دوا دەكەوتن .

چی هەڕەشەیەك لەمە بەهێزترە بۆ كەسێك كە نوێژی بەكۆمەڵ واز لێ بهێنێت لە گەڵ ئەوەدا كات و توانای هاتنی هەبێت .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَتُقَامَ ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ من حَطَبٍ إلى قَوْمٍ لَا يَشْهَدُونَ الصَّلَاةَ فَأُحَرِّقَ عليهم بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ)[1].

واتە: لە خوولیامدا بوو فەرمان بكەم بە دابەستنی نوێژ، پاشان فەرمان بكەم بەكەسێك پێش نوێژی بكات، ئینجا لەگەڵ چەند پیاوێكدا بڕۆین بە چارۆكە دارەوە بۆ لای ئەوكەسانە كە ئامادەی نوێژی بە كۆمەڵ نابن، ماڵەكانیان بسوتێنین بەسەریاندا( كەنایەن بۆ مزگەوت ) .

هەڕەشە ناكات بەسوتاندنی ماڵی هیچ كەسێك ئیللا لەسەر وازهێنان لە ئەركێك نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەماڵەكاندا منداڵ و خێزان و كەلوپەلی تێدایە .

لە (صەحیحی) موسلیمدا هاتووە، پیاوێكی كوێر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا كەسێك نیە من بهێنێت بۆ مزگەوت، داوای لە پێغەمبەرﷺكرد كە ڕێگەی پێ بدات لە ماڵەكەیدا نوێژ بكات، ئەویش ڕێگەی پێدا، بەڵام كاتێك كە پشتی تێكردو ڕۆیشت، بانگی كردو و فەرمووی:( هل تسمع النداء)، واتە: ئایە گوێت لەبانگ دەبێت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی:(فأجب )، واتە وەڵامی بانگ بدەرەوە (دەبێ بێیت بۆ مزگەوت).

[1] – البخاري(٦٤٤)، ومسلم( ٦٥١).

ئەمە پیاوێکی کوێر بوو پرسیاری ئەوەی کرد لە نارەحەتی هاتنیدا بۆ مزگەوت، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەرﷺ رێگەی پێ نەدا لە ماڵەکەیدا نوێژ ئەنجام بدات، چ جا بۆ کەسێك کە تەندروستە و چاوی ساغەو هیچ بیانوویەکی نیە ؟!

( الربیع بن خثیم) بە هۆی نەخۆشییەوە بەشیك لەجەستەی لە کارکەوت،کاتیك کە دەچوو بۆ نوێژ دوو کەس دەچوونە ژێر باڵی، پێی وترا : باوکی محمد، خۆتۆ رێگەت پێدراوە کە لە ماڵدا نوێژ بکەیت چونکە بیانووت هەیە( عذر)، ئەویش وتی : ئێوە بۆ خۆتان دەڵێن،بەڵکو من گوێم لە بانگدەرە دەڵێت: (حي على الصلاة حي على الفلاح) جا هەرکەسێك پێی دەکرێ و دەتوانێ وەڵامی بداتەوە، تەنانەت ئەگەر بە خشان یان لە سەر سك بێت با بڕوات و ئەنجامی بدات.

(حاتم الاصم) دەڵێت: جارێك نوێژێکی بە کۆمەڵم لە دەست چوو( أبو أسحاق البخاری) هات بۆ لام و سەرەخۆشی لێکردم، بەڵام ئەگەر منداڵێکم بمردایە ئەوا دە هەزار کەس دەهاتن بۆ سەرەخۆشی کردن، لەبەرئەوەی بەڵاو مووسیبەتی دین لای خەڵك ئاسانترە لە بەڵاو موسیبەتی دنیا.

## بەشێکی تر

## لە فەزڵ و گەورەیی ئامادەبوونی نوێژی خەوتنان( العشاو ) و بەیانیان.

ئامادەبوونی نوێژی شێوان و بەیانیان و بەتەنگەوەهاتنیان زۆر پێویستە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( لیس صَلَاةٌ أَثْقَلَ على الْمُنَافقِينَ من الْفَجْرِ وَالْعِشَاءِ وَلَوْ يَعْلَمُونَ ما فيهِمَا لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)[1].

واتە : هیچ نوێژێك بەقەد نوێژی بەیانییان و خەوتنان قورس نیە لەسەر دووڕووەکان، ئەگەر بیانزانیایە چ خێرێکی تێدایە بۆی دەهاتن ئەگەر بە گاگۆڵکێش بوایە .

[1] – البخاري ( ٦٥٧ )، ومسلم ( ٢٥٢ ).

# تاوانی پێنجەم

## نەدانی زەكات

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ ( ال عمران: ١٨٠). واتە: وا گومان نەبەن ئەوانەی كە بەخیلی و ڕەزیلی دەكەن، لەو نازو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیوون، نابەخشن، كارێكی چاكە بۆیان، نەخێر ئەوە كارێكی خراپ و نادروستە بۆیان، چونكە ئەو شتانەی كە نەیاندەبەخشی لە ڕۆژی قیامەتدا دەست دێنێتە بینیان و دەبنە كۆت لە گەردنیاندا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ ۝٦ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ (فصلت: ٦، ٧ ). واتە: وەیل و سزای سەخت بۆ موشریك و هاوەڵگەران ئامادەیە. ئەوانەی كە زەكات نادەن و ئەوانەش كە بێ باوەڕن بە ڕۆژی قیامەت.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ۝٣٤ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ ۖ هَـٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ ( التوبة: ٣٤، ٣٥ ). واتە: ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە، چاك بزانن كە زۆربەی حاخامی جوولەكەكان و قەشەی گاورەكان، ماڵ و سامانی خەڵكی بە ناحەق دەخۆن، بەرهەڵستی ڕێبازو ئاینی خوا دەكەن، جا ئەوانەی كە ئاڵتوون و زیو كۆ دەكەنەوە و قایمی دەكەن و لە پێناوی ڕێبازی خوادا و بۆ ڕەزامەندی ئەو نایبەخشن، مژدەی سزایەكی پڕ ئێشیان بدەرێ

!! ( ئەو سزا سەختە ) لە ڕۆژێكدا دەبێت ئەو پارەو سامانەی كۆیان كردوەتەوە، لە دۆزەخدا سوور دەكرێتەوە، ناو چاوو و لا تەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەكرێت، ئینجا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو سامانەیە كە كۆتان دەكردەوە بۆ خۆتان، دە بچێژن سزای ئەوەی كە بۆ خۆتان كۆتان دەكردەوە.

پیغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ما من صَاحِبِ ذَهَبٍ ولا فضَّةٍ لَا يُؤَدِّي منها حَقَّهَا إلا إذا كان يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ له صَفَائِحُ من نَارٍ فَأُحْمِيَ عليها في نَارِ جَهَنَّمَ فَيُكْوَى بها جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ كُلَّمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ له في يَوْمٍ كان مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حتى يُقْضَى بين الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إلى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إلى النَّارِ قِيلَ يا رَسُولَ اللَّهِ فَالْإِبِلُ قال ولا صَاحِبُ إِبِلٍ لَا يُؤَدِّي منها حَقَّهَا وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يوم وِرْدِهَا إلا إذا كان يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لها بِقَاعٍ قَرْقَرٍ أَوْفَرَ ما كانت لَا يَفْقِدُ منها فَصِيلًا وَاحِدًا تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا كُلَّمَا مَرَّ عليه أُولَاهَا رُدَّ عليه أُخْرَاهَا في يَوْمٍ كان مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حتى يُقْضَى بين الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إلى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إلى النَّارِ قِيلَ يا رَسُولَ اللَّهِ فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ قال ولا صَاحِبُ بَقَرٍ ولا غَنَمٍ لَا يُؤَدِّي منها حَقَّهَا إلا إذا كان يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لها بِقَاعٍ قَرْقَرٍ لَا يَفْقِدُ منها شيئا ليس فيها عَقْصَاءُ ولا جَلْحَاءُ ولا عَضْبَاءُ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا كُلَّمَا مَرَّ عليه أُولَاهَا رُدَّ عليه أُخْرَاهَا في يَوْمٍ كان مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حتى يُقْضَى بين الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِمَّا إلى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إلى النَّارِ [١].

واتە: هیچ خاوەن زێڕ و زیوێك نیە كە حەقی نەدات ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دەخرێتە ئاگر، ئینجا لە ناو ئاگری دۆزەخدا تەنیشت و ناوچەوان و پشتی پێ داخ دەكرێت، هەركە سارد بووەوە دەیگەڕێننەوە بۆ دۆخی پێشوو،لە ڕۆژێكدا كە بەرامبەر بە پەنجا هەزار ساڵە، هەتا ئەو كاتەی دادوەری دەكرێت لە نێوان بەندەكانی خوادا، ئینجا ڕێگەی پێ نیشان دەدرێت یان بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخ ) وترا: ئەی پێغەمبەری خوا خاوەن

حوشتریش؟ فەرمووی: (هیچ خاوەن حوشترێك نیە كە مافی(زەكاتی) نەدات ئیللا لە ڕۆژی دواییدا، لەسەردەم دەیكەوێنن لە زەویەكی فراواندا، هەتا شوێنێك لە جەستەی نامێنی بە سمەكانی دەیشێلێت و بە ددانەكانی گازی لێ دەگرێت، هەركە یەكەم دانەی بەسەریدا تێپەری دواین دانە دێت بەسەریدا، لەڕۆژێكدا بەرامبەر بە پەنجا هەزار ساڵە، هەتا ئەو كاتەی دادوەری دەكرێت لە نێوان بەندەكانی خوادا، ئینجا ڕێگەی پێ نیشان دەدرێت یان بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخ)، وترا: ئەی پێغەمبەری خوا خاوەن مانگاو مەڕیش؟ فەرمووی: (هیچ خاوەن مانگاو مەڕێك نیە كە مافی(زەكاتی) نەدات ئیللا لە ڕۆژی دواییدا لەسەر دەم دەیكەوێنن لە زەویەكی فراواندا، هیچی لەوانە بۆ نامێنێتەوە، نە شاخ چەماوەو نە بێ شاخ و نە شاخ شكاو، بە شاخەكانی قۆچی لێ دەدات و بە سمەكانی دەیشێلێت هەركە یەكەم دانەی بەسەریدا تێپەری دواین دانە دێت بەسەریدا، لەڕۆژێكدا بەرامبەر بە پەنجا هەزار ساڵە، هەتا ئەو كاتەی دادوەری دەكرێت لە نێوان بەندەكانی خوادا، ئینجا ڕێگەی پێ نیشان دەدرێت یان بۆ بەهەشتە یان بۆ دۆزەخ).

لە (أبو هريرة) وە - ڕەزای خوای لێ بێت – دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من آتَاهُ الله مَالًا فلم يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ له يوم الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ له زَبِيبَتَانِ يُطَوَّقُهُ يوم الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُ بلهزميه يَعْنِي شدقيه ثُمَّ يقول أنا مَالُكَ أنا كَنْزُكَ ثُمَّ تَلَا).

واتە :هەركەسێكماڵێكی پێ ببەخشێت و زەكاتی لێ نەدات، لە ڕۆژی دواییدا لێی دەبێت بە پیرە مارێكی كەچەڵ، دوو نێزەی هەیە، بە ملیدا دەئاڵێ و هەردوو شەوێلكەی دەگرێ و پێی دەڵێت: من ماڵەكەتم، من گەنجینەكەتم، پاشان، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَلَا يَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ هُوَ خَيْرًا لَّهُم بَلْ هُوَ شَرٌّ لَّهُمْ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا۟ بِهِۦ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾( ال عمران: ١٨٠)[٢]. واتە: وا گومان نەبەن ئەوانەی كە بەخیلی و ڕەزیلی دەكەن، لەو نازو نیعمەتانەی خوا پێی بەخشیوون، نابەخشن، كارێكی

---

[٢] – البخاري ( ١٤٠٣ ) .

چاکە بۆیان، نەخێر ئەوە کارێکی خراپ و نادروستە بۆیان، چونکە ئەو شتانەی کە نەیاندەبەخشی لە ڕۆژی قیامەتدا دەست دێنێتە بینیان و دەبنە کۆت لە گەردنیاندا.

(ابن مسعود) – ڕەزای خوای لێ بێت – لەم دەقەی قورئاندا کە دەربارەی ئەو کەسانە دابەزیووە زەکاتی ماڵەکەیان نادەن : ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ (التوبة: ٣٥).

واتە: (ئەو سزا سەختە) لە ڕۆژێکدا دەبێت ئەو پارەو سامانەی کۆیان کردۆتەوە، لە دۆزەخدا سوور دەکرێتەوە، ناوچەوان و لاتەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەکرێت، ئینجا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو سامانەیە کە کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان، دە بچێژن سزای ئەوەی کە بۆ خۆتان کۆدەکردەوە .

فەرمووی: هیچ دینار و درهەمێك لەسەر یەك دانانرێ و کۆناکرێتەوە ، بەڵکو پێستی لەشی فراوان دەبێت تاکو هەموو دینار و درهەمەکانی هەیبوو لەسەری دابندرێت .

ئەگەر وترا: بۆچی ناوچاوان و تەنیشت و پشت تایبەت کراوە بەداخ کردن ؟ دەوترێت: چونکە دەوڵەمەندی ڕەزیل ئەگەر هەژارێك ببینێت چاوی لێ دەشارێتەوە و لای لێ دەکات، ئەگەر نزیك بوویەوە لێی، ئەوە پشتی تێدەکات، ئەو ئەندامانە داخ دەکرێن، لەبەر ئەوەی دەبێت پاداشت لە چەشنی کردەوە بێت.

## ئامۆژگاری

بەو کەسانە بڵێ کە لە دنیادا فیڵبازی و ساختەکار سەرقاڵی کردوون، بەڕاستی سبەینێ هاوارو دادیان دەبێت – ئەوەی کۆیان کردووەتەوە سوودیان پێ ناگەیەنێت – ئەگەر ڕۆژیی دواییان هات ئەبێ چۆن لەبەر چاوو دڵیان دیار نەمابێ و وون بووبێت ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ

لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ ماڵەکەی لەگەڵ خۆی برد بۆ شوێنی سزادان، خستویەتیّ ناو بەودەقێکەوە، بۆ ئەوەی پلێتەکان گەرم بێت و سزاکەی داخکردنی بەهێز تر بکات:

ئەگەر هەژارێکیان تووش بێت، وادەزانن سزایان تووش بووە، ئەگەر داوای شتێکی لیّ بکەن زۆر تورە دەبن وەك پشکۆیەکی گەشاوەیان لیّ دێت، خۆ ئەگەر بەنەرم و نیانی وەڵامیان بدەنەوە ئەم جۆرە قسەو قسەلۆکە دەڵێن: فلاّن کەس هاوکاری کردیت، یا ئەوەی تۆ داوای دەکەی وانیە، یا ئەگەر خوای گەورە بیویستایە ئێوەشی بیّ نیازو دەوڵەمەند دەکرد.

بەلاّم ئەم جۆرەکەسانە حیکمەتی خوایان بیرچووەتەوە لە دەوڵەمەندکردن و هەژارکردندا، ئای خوایە گیان ئەبیّ چەندە خەمبار و پەشیمانبن کاتێك دەچنە ناو گۆرەکانیان ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ لە داهاتویەکی نزیکدا میراتگرەکانیان بەبیّ ماندووبوون بەشی خۆیان دەبەن، ئەو پرسیاری لیّ دەکرێت چۆن ئەم پارەی کۆ کردوەتەوە و لە چیدا خەرجی کردووە، بەلاّم درکەکەی بۆ ئەوەو بەرهەمەکەی بۆ میراتگرە، کوانیّ سووربوونی ماڵ کۆکەرەوەکان، ئەی کوا ئەقڵیان ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ خۆ ئەگەر لە ڕیزەکانی دۆزەخدا بیان بینیت، لەناو ئەو دینارو درهەمانەدا دەسووتێن کە بووە بە پشکۆ لای ڕاست و چەپیان داخ دەکات کە لە دنیادا ڕویان لەهەژاران وەردەگێرا.

ئەگەر لە دۆزەخدا بیان بینیت ئاوی (حمیم) یان دەرخوارد دەدرێت، چۆن شێواو و هاوارو دادیانە ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ

هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ چەند جار لە دنیادا ئامۆژگاری دەکران بەڵام ئەوان بەهیچ شێوەیەك کەڵکیان لێ وەرنەدەگرت.

چەند جار ترسێنران بە سزای خوا هیچ یەکێك لەوان بە بای خەیاڵیدا نەدەهات.

چەند جار بە نەدانی زەکات ئاگەدار کرانەوە هیچ یەکێك لەوان ئامادەیی تێدا نەبوو زەکات بدات .

وایان دەزانی بەو ماڵ و سامانە دەبن بە زیرەکترین و بەنرخترین کەس، خۆ ئەوە نە دار عەسای پێغەمبەر موسایە و نە کێوی (طور)ە ﴿ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾)؟ ( التوبة: ٣٥). واتە : ((ئەو سزا سەختە ) لە ڕۆژێکدا دەبێت ئەو پارەو سامانەی کۆیان کردۆتەوە، لە دۆزەخدا سوور دەکرێتەوە، ناو چەوان و لاتەنیشت و پشتیانی پێ داخ دەکرێت، ئینجا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو سامانەیە کە کۆتان دەکردەوە بۆ خۆتان، دە بچێژن سزای ئەوەی کە بۆ خۆتان کۆدەکردەوە ).

# تاوانی شەشەم

## بەرۆژوو نەبوونی رۆژێك لە مانگی رەمەزان بە بێ بیانوو

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ ﴾ ( البقرة: ١٨٣ – ١٨٤ ) واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەروەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو بیگرن، بۆ ئەوەی خواناسی و پارێزگاری بکەن. چەند ڕۆژێکی ژمێردراوی دیاریکراوە ( کە مانگی ڕەمەزانە ) خۆ ئەگەر کەسێك لە ئێوە نەخۆش بوو یان لە سەفەردا بوو با بە ئەندازەی ئەو ڕۆژانەی بۆی نەگیراوە لە ڕۆژانێکی تردا بیانگرێتەوە.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: (بُنِيَ الْإِسْلَامُ علی خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إلا الله، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رسول اللّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ،وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ).

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: شایەتیدان کە هیچ کەس شایەنی پەرستن نیە جگە لە خوای تاقانە، ( محمد ) یش ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، هەروەها نوێژ کردن، زەکاتدان، حەج کردن ڕۆژوو گرتن ).

لە ( ابن عباس ) وە - ڕەزای خوای لێ بێت – دەڵێت: بنەمای ئیسلام و دین سێ شتە: شایەتیدان کە هیچ کەس شایەنی پەرستن نیە جگە لە خوای تاقانە، نوێژکردن، ڕۆژوو گرتن، هەرکەسێك یەکێك لەمانە واز لێ بهێنێت ئەوە بێ باوەڕە.

# تـاوانی حەوتەم

## وازهێنـان لە فەریزەی حەج لە گەڵ بوونی توانـادا

خوای گەورە دەفەرمویێت:﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾ ( ال عمران: ٩٧ ). واتە: خوای گەورە بڕیاریداوە لەسەر خەڵکی حەج و سەردانی ( بیت الحرام ) بەتەنها ئەوانەی کە توانای( دارایی و تەندروستییان ) هەیە.

(عمر) کوڕی (خطاب) دەڵێت: واهات بە خەیاڵمدا چەند پیاوێك بنێرم بۆ شارەکان، تەماشا بکەن بزانن کێ توانای هەیە و حەج ناکات، سەرانەیان(جزیة) لێ وەربگرن چونکە ئەوانە موسڵمان نین.

وەلە (ابن عباس ) وە دەڵێت: هیچ کەسێك نیە حەج نەکاو زەکاتی ماڵەکەی نەدات، ئیللا لە کاتی مردنیدا داوای گەڕانەوە دەکات بۆ دنیا، ئەمەش تەنها بێ باوەڕان داوای گەڕانەوە دەکەن؟ وتی: ئەمە لە کتێبی خوادا هاتووە: ﴿ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِىٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ ﴿١١﴾ ﴾ واتە: زەکاتی ماڵم دەربکردایە ﴿ وَأَكُن مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ ( المنافقون: ١٠ ) واتە: حەجم دەکرد ﴿ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَا ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ ( المنافقون: ١١ ) وترا: زەکات لە چەند واجب دەبێت؟: وتی: بە دووسەد دینار بە قیمەتی ئاڵتون. وترا: ئەی حەج بە چی واجب دەبێت؟ وتی: بە تێشوو( خواردنت هەبێت بۆ ڕێگەو بان )، حوشتری بەرز ( هۆی گواستنەوە بۆ ڕێگەو بان ).

لە ( سعید ) کوری ( جبیر )وە دەڵێت: هاوسێیەکم مرد و توانای حەج کردنی هەبوو بەڵام حەجی نەکرد، نوێژم لەسەری نەکرد .

# تاوانی هەشتەم

## دڵ ئێشانی دایك و باوك

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾ (الاسراء: ٢٣ ) واتە: پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە كە جگە لەو كەسی تر نەپەرستن، هەروەها بڕیاری داوە چاكە كاریش بن لەگەڵ دایك و باوكتاندا، هەركاتێك یەكێكیان یا هەردووكیان بە پیری كەوتنە لای تۆ ( تەنانەت ) ئۆفیان لەدەست مەكە و (هەرگیز) پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بەسەردا مەكە، بەردەوامیش قسەو گفتووگۆت لەگەڵیاندا باچاك و جوان و بەجێ بێت .

مانای ئەوەیە چاك و نەرموونیان و بەسۆز بن لەگەڵیاندا . ئەگەر كەوتنە ساڵەوە بە بێزارییەوە قسەیان لەگەڵ مەكەن .

پێویستە چۆن ئەوان خزمەتی تۆیان كردووە بەهەمان شێوە تۆش خزمەتیان بكەیت، لەگەڵ ئەوەشدا فەزڵ و گەورەیی بۆ دایك و باوكە بەهیچ شێوەیەك یەكسان نابن ئەو دوو خزمەتە، بەردەوام ئەوان بەرگەی ناڕەحەتیەكانی تۆیان گرتووە ئەمەش لە پێناو ئەوەی كە تۆ بژێت، بەڵام ئەگەر ئەوان تۆزێك لە پیریدا ئازاری تۆ بدەن حەز دەكەی بمرن و ڕزگارت بێت لێیان، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ ﴾ واتە: قسەیەكی زۆر لەسەرخۆو نەرم و نیان.

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ ﴾ (لقمان: ١٤ )

تەماشا بكە ڕەحمەتی خوات لیٚ بێت چۆن خوای گەورە سوپاسی خۆی بەستوەتەوە بە سوپاسی دایك و باوكەوە.

( ابن عباس ) دەڵێت: سیٚ شت گریٚ دراون بە سیٚ شتەوە، یەكێكیان قبولٚ نابێت بەبیٚ ئەوی تریان:

یەكەم: خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟ ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾ (المائدة: ٩٢) واتە: (ئەی ئیمانداران فەرمانداری خوا بن، فەرمانداری پێغەمبەریش بن و وریا بن و ئاگادار بن (نەكەن سەرپێچی لە فەرمان و ڕێنماییەكانیان بكەن) جا ئەگەر پشت هەڵكەن و یاخی ببن ئەوە بزانن بەڕاستی كاری پێغەمبەری ئێمە تەنها ڕاگەیاندنی ئاشكراو ڕوونی پەیامەكەیە.

ئەوەی فەرمانی خوا جێبەجیٚ بكات و فەرمانی پێغەمبەرەكەی جێبەجیٚ نەكات لێی وەرناگیرێت.

دووەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾ (البقرة: ٤٣ ) هەركەسێك نوێژ بكات و زەكات نەدات لێی وەرناگیرێت.

سیٚ یەم: خوای گەورە دەفەرموێت: أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (لقمان:١٤)، هەركەسێك سوپاسی خوا بكات و سوپاسی دایك و باوكی نەكات لێی وەرناگیرێت، لەبەر ئەمەیە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:( رضا الله من رضا الوالدين، وسخط الله من سخط الوالدين )[1]. واتە: ڕەزامەندی خوا بە ڕەزامەندی دایك و باوكەوەیە، توڕەیی خوا بە توڕەیی دایك و باوكە.

[1] — الترمذي( ١٨٩٩)، والحاكم في المستدرك ( ٤ \ ١٥١، ١٥٢ ) وصححه.

له (صەحیحی) بوخاری موسلیمدا هاتووه که پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ) . واته: ئایا هەواڵتان پێ بدەم گەورەترین تاوان کامەیە: شەریك بڕیاردان بۆ خوای گەورە، دڵ ئێشانی دایك و باوك ).

وەهەرکەسێك هاوکاری و چاکەیان لەگەڵ بکات ئەگەر پێویستیان پێی هەبوو، له (صەحیحی) بوخاری موسلیمدا هاتووه : (جَاءَ رَجُلٌ الى رَسُولُ الله ﷺ فقال: يا رَسولُ الله مَن أحَقُّ الناس بِحُسْنِ صَحَابَتِي قال أُمُّكَ قال ثُمَّ من قال ثُمَّ أُمُّكَ قال ثُمَّ من قال ثُمَّ أُمُّكَ قال ثُمَّ من قال ثُمَّ أَبُوكَ ).

واته :پیاوێك هاته خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ شایستەترینی خەڵکە که به چاکی هاوڕێیەتی بکەم، فەرمووی: دایکت، وتی: دوای ئەو چ کەسێ؟ فەرمووی: دایکت. وتی:دوای ئەو کێ؟ فەرموی:دایکت. وتی: دوای ئەو؟ فەرموی: باوکت.

لەم فەرمودەیەدا سێ جار جەختی لەسەر ڕێزگرتن له دایك کردوەتەوە، بۆ باوکیش یەك جار، لەبەر ئەوەی سۆزو بەزەیی دایك زیاترە و نەرمونیانی زۆرترە، له گەڵ ئەوەدا بەبۆنەی ئەو منداڵەوە تووشی دەیان گرفتی قورس و گران دەبێت له ژیاندا، وەك: قۆناغەکانی سك پڕی و منداڵ بوون و شیردان و شەو نخونی و دەیان ئازاری تر .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لا شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ )[1] . واته: سێ پاڕانەوە گیرا دەبێ و هیچ گومانی تێدا نیه: پاڕانەوەی ستەم لێ کراو، پاڕانەوەی ڕێبوار، دوعای باوك له منداڵەکەی .

[1] – أبو داود (١٥٣٦)، والترمذي (١٩٠٥)، وصححه، وابن ماجه( ٣٨٦٢)، وأحمد(٢ \ ٢٥٨ ).

## ئامۆژگاری

ئەی ئەو کەسەی مافەکانت لە بیر خۆت بردوەتەوە، ڕاهاتوو لەسەر سەرپێچی دایك و باوك، بیرت چوەتەوە چی لەسەرت واجبە، بێ ئاگای لەوەی کە تۆ لەنێوان هەردوو دەستی ئەودای، نازانیت چاکەی دایك و باوك بەسەرتەوە قەرزە ؟ بەڵام تۆ ئەو چاکە دەدەیتەوە بە بێ ڕێزی کردن و شورەیی، لەگەڵ ئەوەشدا داوای بەهەشت دەکەی، نازانیت بەهەشت لەژێر پێی دایکتدایە.

نۆ مانگ لە سکیدا هەڵیگرتووی بەئەندازەی نۆ ساڵ، لەکاتی دانانی تۆدا خەریك دەبوو گیان و دڵی دەرچێت، ئینجا لەسنگی پاکی شیری پێداویت، لەبەر تۆ شەونخونی کێشاوە، بەدەستەکانی ڕاستی پیستی تۆی پاك کردوەتەوە، زۆر خواردنی لەبەردەم تۆی داناوە خۆی نەیخواردووە، کۆشی بۆ کردووی بە بێشکە، بەردەوام و بەردەوام لە خەمی تۆدا بووە .

ئەگەر تووشی نەخۆشیەك ببیت، دەگاتە ئەوپەڕی بێزاری و خەفەت، هەرچی هەیەو نیە لە پارە و سامان لە پێناو سەلامەتی تۆدا دەیخاتە بەردەست پزیشك، ئەگەر سەرپشکی بکەن لە نێوان هەڵبژاردنی ژیانی تۆو مردنی ئەودا، ئەوە بەبێ دوو دڵی مردنی خۆی هەڵدەبژێرێت !!

دەبێ چەندین جار بەناشرینترین شێوە مامەڵەت لەگەڵیدا کردبێ، بەڵام ئەو لەبری ئەوەدا بە ئاشکرا و بەنهێنی نزا و دوعای سەرکەوتن و سەرفرازی بۆ کردوویت، کە لە کاتی پیریدا پێویستی بە تۆ هەبوو، بەبای خەیاڵتدا نەدەهات و بە سادەترین شێوە مامەڵەت لەگەڵیدا دەکرد، خۆت تێر دەکرد و ئەو بەزگی برسی، سەرزەنشتت دەکردو ئەو هەر ڕازی بووە، فەزڵی ماڵ و منداڵت داوە بەسەر ئەودا، خزمەت کردنی زۆر ئاسان بووە بەڵام تۆ بەلاتەوە زۆر بەزەحمەت و گران تەماشات دەکرد، تەمەنی مانەوەی لای تۆ زۆر کەم بوو، بەڵام تۆ بەلاتەوە زۆر زۆر بوو، پشتت تێ دەکردو ئەویش تەنها تۆی شك دەبرد .بەڵام

نازانی خوای گەورە تەنانەت وتنی وشەی ئۆفیشی قەدەغەكردوە بەرامبەر بە دایك و باوك، ئەگەر ئازاریان بدەی چاوەڕوان بە لە دونیادا سزا دەدرێیت پێش قیامەت، ئەمەش بەهۆی لە فەرمان دەرچوونی مندالّەكانت، لەدوا ڕۆژیشدا بە دووركەوتنەوە لە ڕەحمەتی خوا سزا دەدرێیت ، بانگ دەكرێیت بە زمانی هەڕەشەو سەرزەنشتكردن: ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ (الحج: ١٠). واتە: (ئەوسا پێی دەوترێت) ئەم سەرئەنجامە كارەكانی خۆتە تووشت هاتووە، بێگومانیش خوا بە هیچ جۆرێك ستەم لە بەندەكانی ناكات.

# تاوانی نۆیەم

## وازهێنان لە خزم

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ﴾ ( النساء: ١) واتە: لەو خوایە بترسن كە لەیەكتر داوادەكەن بە ناوهێنانی ئەوەوە، هەوڵ بدەن پەیوەندی خزمایەتیش بپارێزن و (پتەوی بكەن) چونكە بە ڕاستی خوا (هەمیشەو بەردەوام) چاودێرە بە سەرتانەوە.

وەخوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِى ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴾ (محمد:٢٢،٢٣) واتە: ئایا ئێوە بە تەمان ئەگەر لە غەزا پشت هەڵ بكەن یاخود دەسەڵاتتان كەوتە دەست، تۆوی ئاژاوە و گەندەڵی و تاوان لە زەویدا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لە ناوی بەرن ؟! ئەو جۆرە كەسانە ئەوانەن كە خوا نەفرینی لێ كردوون و كەڕی كردوون و كوێرایی هێناوە بە سەر چاویاندا . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلۡمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلۡحِسَابِ ﴾(الرعد: ٢٠ - ٢١) واتە: ئەو كەسانەن وەفا دەكەن و بە ئەمەكن لە بەرامبەر ئەو پەیمانەوە كە هەیانە لەگەڵ خوای پەروەردگارداو ئەو پەیمانەش ناشكێنن و بەڵێن هەڵناوەشێننەوە.... ئەوانەش كە هەرچی خوا فەرمانی بە گەیاندنی داوە دەیگەیەنن و بە دڵ لە پەروەردگاریان دەترسن و لە لێپرسینەوەو حیسابی توندی قیامەتیش سڵ دەكەنەوە .

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:( قال لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعٌ ). واتە: ناچێتە بەهەشتەوە كەسێك پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێت.

هەروەها فەرموویەتی:( وَمَنْ كان يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ). واتە: هەركەسێك بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بكات .

وە فەرموویەتی:( ليس الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ وَلَكِنْ الْوَاصِلُ الذي إذا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا). واتە: خزم دۆست ئەو كەسە نیە كە لە بەرامبەری سەردان و پەیوەندی خزمایەتی، سەردان بكات، بەڵكو خزم دۆست ئەو كەسەیە ئەگەر سەردانی نەكراو پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ پچڕا ئەو بیكات و بەجێی بێنێ .

وە پێغەمبەر فەرموویەتی: ( خوای گەورە دەفەرموێت: ( أَنَا الرَّحْمَنُ وَهِيَ الرَّحِمُ فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا قَطَعْتُهُ ). واتە: من (الرحمن )م پەیوەندی خزمایەتیش( صلة الرحم) ڕەحم و سۆزە، هەركەسێك خزم دۆستی و سەردانی خزم بكات، ئەوە منیش سۆزو بەزەیی بەسەردا دەڕژێنم، ئەوەش پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێت منیش دەیپچڕێنم .

( علي) كوری (حسين ) — ڕەزای خوایان لێ بێت — بە كوڕەكەی وت: ئەی كوڕە بچكۆلەكەم: هاوڕێیەتی ئەو كەسە مەكە كە سەردانی خزم و كەس ناكات ( صلة الرحم ) چونكە من لە سێ شوێنی قورئاندا بینیومە نەفرینی لێ كراوە .

# تاوانی دەیەم

# زیناکردن

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ (الإسراء:٣٢) . واتە: هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو و تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵایە .

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾(الفرقان:٦٨-٧٠). واتە: هەروەها ئەوانەی هیچ جۆرە پەرستراوێکی تر لەگەڵ خوادا ناپەرستن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر بەحەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و نزیکی ناکەون، جا ئەوەی ئەو جۆرە کارە خراپانە ئەنجام بدات ئەوە تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت. لەقیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرانبەر دەکرێت و بەزەلیلی و خەجاڵەتی و شەرمەزارییەوە دەبێت ژیانی تێدا بەرێتە سەر. مەگەر ئەو کەسەی کە تەوبە بکات و باوەڕ بهێنێت و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا کارو کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە، چونکە هەمیشە و بەردەوام خوای گەورە لێخۆشبوو میهرەبانە.

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾(النور: ٢). واتە: سەد قامچی لەهەریەك لە ئافرەت و پیاوی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت

لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو بە ڕۆژی دوایی هێناوە، با دەستەیەکیش لە ئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن.

زانایان دەفەرموون: ئەمە سزای ئەوکەسەیە کە لە دونیادا زینا دەکات، ئەمە ئەگەر گەنج بوو ژنی نەهێنابوو یا شووی نەکردبوو – بەڵام ئەگەر ژندار بوو یان شووی کردبوو ئەگەر یەك جاریش بێت لە ژیانیدا، ئەوە بە بەرد ڕەجم دەکرێن هەتا دەمرن، بەوشێوەیە ئەمە لە سوننەتی پێغەمبەردا هاتووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: قال لَا يَزْنِي الزَّانِي حِين يَزْنِي وهو مُؤْمِنٌ، ولا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِين يَسْرِقُ وهو مُؤْمِنٌ، ولا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِين يَشْرَبُهَا وهو مُؤْمِنٌ، ولا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً ذَاتَ شَرَفٍ يَرْفَعُ الناس إليه أَبْصَارَهُمْ فيها حِين يَنْتَهِبُهَا وهو مُؤْمِنٌ )[٢] .

واتە: زیناکەر لە کاتی زینا کردنەکەدا باوەڕدار نابێت، مەیخۆر لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا باوەڕدارنابێت، دز لە کاتی دزیکردنەکەیدا باوەڕدارنابێت، وە کەسێك کە خەڵك بۆی بڕوانن لە کاتی تاڵانکردنەکەیدا باوەڕ دارنابێت ).

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە لە باسی خەوی پێغەمبەر ﷺ کە( سمرة بن جندب ) دەیگێڕێتەوە، تێیدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ جبریل و میکائیل هاتن بۆ لای، فەرمووی:( فانطلقا فأتينا على مثل التنور، أعلاه ضيق و أسفله واسع، فيه لغط وأصوات، قال: فاطلعنا فيه فإذا فيه رجال ونساء عراة،فإذا هم يأتيهم لهب من أسفل منهم، فإذا أتاهم ذلك اللهب ضوضوا، أي صاحوا من شدة حره، فقلت لهما: من هؤلاء، قالا: هؤلاء الزناة والزواني – يعني من الرجال والنساء – فهذا عذابهم إلى يوم القيامة). واتە: کەوتینە ڕێی هەتا گەشتین بە شتێك وەك تەنوور وابوو سەرەوەی تەنگ و خوارەوەی فراوان، دەنگ و هاواری لێ دەهات، فەرمووی: تەماشامان کرد بینیمان کۆمەڵە پیاو و ئافرەتێکی بە ڕوتی تێدایە، لە خوارەوە ئاگریان بۆ دەهات، کە ئەو ئاگرە تیژەی دەگەیشتە جەستەیان پڕ

---

[٢] – البخاري(٢٤٧٥)، ومسلم(٥٧) .

بەدەم هاواریان دەکرد، منیش بە جبریل و میکائیلم فەرموو: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەوکەسانەن کە زینا دەکەن – لە ئافرەتان و پیاوان – تا ڕۆژی دوایی ئەمە سزایانە.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە : شەیتان سەربازەکانی لەسەر زەویدا بڵاو دەکاتەوە و پێیان دەڵێت: کێ لە ئێوە موسڵمانێکی لە ڕێگە دەرکرد، ئەوە تاجێکی گوڵینە لە سەری دەنێم، جا گەورەترین و باشترینیان ئەوکەسەیە کە فیتنەکەی گەورەتر بێت، یەکێکیان دێت بۆ لای پێی دەڵێت: وازم لەو پیاوە نەهێنا هەتا خێزانەکەی تەڵاقدا، شەیتان دەڵێت: شتێکی زۆر گرنگت نەکردووە، ژنێکی تر دەهێنێت، پاشان دانەیەکی تریان دێت و دەڵێت: وازم لەو پیاوە نەهێنا هەتا لەگەڵ براکەیدا دایانم بەشەڕدا، ئەویش دەڵێت: شتێکی گرنگت نەکردووە، تۆزێکی تر ئاشت دەبنەوە، پاشان یەکێکی تریان دێت و دەڵێت: وازم لەو پیاوە نەهێنا هەتا زینام پێکرد، شەیتانیش دەڵێت: ئافەرین باشترین شتت کردووە ئینجا لە خۆی نزیکی دەکاتەوە و تاجی ڕێزی لە سەری دەکات.

گەورەترین زینا: زینا کردنە لەگەڵ دایك و خوشك ژنی باوکدا، وەلە (البراء) وە کە خاڵۆی پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ لای پیاوێك کە ژنی باوکی خۆی مارەکردبوو کە بیکوژێت و ماڵەکە بە پێنج یەك دابەش بکات.

# تاوانی یازدەهەم

## نێربازی ( اللواط )

خوای گەورە لە چەندین شوێنی کتێبەکەیدا چیرۆکی نەتەوەی (لوط)ی بۆ باس کردووین، لەوانەش: (﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ۝٨٢ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴾ (هود:٨٢،٨٣) . واتە: جا کاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرە و ژوور کرد و بە قوڕی سوورەوە کراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەرد بارانمان کرد. هەموو ئەو بەردانە دیاری کراو بوون، لە لایەن پەروەردگارتەوە( کە بدات بەسەر تەوقە سەری کێدا ) ئەم کارەسات و ئەم بەرد بارانەش وەنەبێت زۆر دوور بێت لە ستەمکارانەوە(لە هەموو سەردەمێکدا، کاتێك ڕۆدەچن لە تاوانکاریدا ).

ستەمکارانی ئەم ئوممەتەش ئەگەر ئەو کارەی نەتەوەی (لوط) بکەن شایەنی ئەوەن وەك ئەوان سزا بدرێن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :( إِنَّ أَخْوَفَ ما أَخَافُ على أُمَّتِي عَمَلُ قَوْمِ لُوطٍ ). واتە: ترسناکترین شت کە دەترسم بەسەر ئوممەتەکەمدا بێت کاری قەومی (لوط)ە نێربازی.

پێغەمبەر سێ جار نەفرەتی لێ کردوون، فەرموویەتی : (لَعَنَ اللَّهُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، لعَنَ اللَّهُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، لعَنَ اللَّهُ مَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ)[٢] . واتە:

---

[٢] – أخرجه أحمد ١ \ ١٢٧، ٣٠٩، وابن حبان(٥٣) .

نەفرەتی خوا لەوکەسەی کە کاری نەتەوەی(لوط) دەکات، نەفرەتی خوا لەوکەسەی کاری نەتەوەی(لوط) دەکات، نەفرەتی خوا لەوکەسەی کاری نەتەوەی(لوط) دەکات.

هەروەها فەرموویەتی: ( من وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ). واتە: هەرکەسێکتان بینی کاری نەتەوەی ( لوط) ی ئەنجامدا بکەر و کارتێکراو بکوژن.

زانایانی ئیسلام یەك دەنگن لە سەر ئەوەی نێربازی یەکێکە لە تاوانە گەورەکان کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە، وەك دەفەرموێت: ﴿ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴾ (الشعراء: ١٦٥ – ١٦٦ ). واتە: ئایا لەناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئێوە بەشوێن نێرینەدا دەگەڕێن و دەتانەوێت ئارەزووی جووت بوون لەگەڵ ئەواندا جێبەجێ بکەن ؟ وازیش دەهێنن لە هاوسەر کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون، بەڵکو ئێوە هەر قەومێکی نالەبارو بەدڕەوشت و ناڕەسەنن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلُوطًا ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَت تَّعْمَلُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ۗ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمَ سَوْءٍ فَٰسِقِينَ ﴾(الانبياء: ٧٤). واتە: بە ( لوط ) پێغەمبەریش حیکمەت و دانایی و زانیاریمان بەخشی و ڕزگارمان کرد لەو شارەی کە کردەوە پیسەکانیان تێدا ئەنجام دەدا، بێگومان ئەوانە قەومێکی نالەبارو خراپ و بەدخوو تاوانکار بوون.

ئەو گوندەی کە ئەو کارەی تێدا ئەنجام دەدرا ناوی (سدوم) بوو، خەڵکی ئەو گوندە ئەو کارە پیسانەیان ئەنجام دەدا کە خوای گەورە باسی کردووە، پیاوەکان دەچوونە لای یەکتریەوە لە باڕو یانەکانیاندا زڕتیان دەکێشا، لەگەڵ چەندین شتی ناپەسەندو نا ماقوڵ!.

تەماشاکردنی لوسکەو بێ تووك و ئافرەت بە مەبەستی ئارەزووی جنسیەوە زینایە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:( زِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ وَالنَّفْسُ تتمنى

وَتَشْتَهِي وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذلك كُلَّهُ أو يكذبه )[٣]. واتە: زینای چاو تەماشاکردنی نامەحرەمە، زینای زمان قسەکردنە، هەواو ئارەزو و ئاوات دەخوازێت و حەز دەکات، داوێنیش یان ئەوە دەسلمێنێت یا دەیخا بە درۆوە .

( سفيان الثوري) چووە حەمامەوە منداڵێکی جوانیش هاتە ژورەوە، وتی: دەریکەنە دەرەوە، بەڕاستی من لەگەڵ هەر ئافرەتێکدا شەیتانێك بەدی دەکەم، وەلەگەڵ هەر منداڵێکدا چەندین شەیتان بەدەی دەکەم .

پیاوێك هاتە لای ئیمامی (أحمد) منداڵێکی لەگەڵدا بوو، ئیمام (أحمد) پێی وت: ئەمە کێیە لەگەڵتدا ؟ وتی: کوڕی خوشکمە، ئیمام (أحمد) وتی: جارێکی تر مەیهێنە بۆ لامان، وەلەگەڵیدا ڕێ مەکە نەوەك گومانی خراپت پێ ببەن، ئەوەی کە تۆ و ئەو نەناسێ .

## بەش
## سزای ئەو کەسەی کە خەڵکی دەباتە لای خۆی

دەگێڕنەوە لە(خالد) ی کوڕی ( ولید) کە پیاوێکی لە یەکێك لە ناوچەکان بینی کە لە دواوە خەڵکی دەچوونە لای، نامەیەکی نارد بۆ خەلیفە (أبو بكر الصديق) – ڕەزای خوایان لێ بێت – ئەویش ڕاوێژی بەهەندێك لە هاوەڵانی کرد، ئیمامی (علي ) کوڕی ( أبي طالب) فەرمووی: ئەم کارە تەنها یەك نەتەوە کردوویانە، خوای گەورە فێری کردووین چی پێیان کردووە، منیش پیم وایە بەئاگر بسووتێنرێت، پاشان (أبو بكر ) نامەیەکی نارد کە بسووتێنرێت، پاشان خالد سوتاندی.

٣ – البخاري(٦٢٤٣)، ومسلم(٢٦٥٧).

## بەشێکی تر
## دەربارەی چوونە لای ئافرەت لە دواوە

ئەوەی پەیوەندی بە (لواط) وە هەیە چونە لای ئافرەتە لە دواوە، ئەمەش خواو پێغەمبەرەکەی قەدەغەیان کردووە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾ ( البقرة: ٢٢٣) .واتە: چۆن دەتوانن بە ئارەزووی خۆتان لە پێش و پاشەوە بچنە لایان بەلأم بە تەنها لەیەك شوێنەوە (وەك لەشەرعدا دیاری کراوە ).

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بوو: کە جولەکەکان لە سەردەمی پێغەمبەردا دەیانوت: ئەگەر پیاوێك بچێتە لای خێزانەکەیەوە لە دواوە بەلأم بیخاتە پێشەوە، ئەوە منداڵەکە خێل دەبێت، هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ پرسیاری ئەوەیان لیٚ کرد، خوای گەورە لە وەلأمدا بۆ بە درۆ خستنەوەی جولەکەکان ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّىٰ شِئْتُمْ ﴾ کە دەتوانن بچنە لای خیزانەکانتان ئەگەر ویستی با لەسەر شێوەی سوژدە یان کڕنۆش با بچنە لایان بە یەك دەمەوانەوە. واتە: تەنها ئەو شوێنەی کە شەرع دیاری کردووە، ئەویش بریتیە لە شوینی منداڵ بوون، بەلأم دواوە تەنها شوێنی فڕێدانی پیسیە بۆیە پیس و قیزەونە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (مَلْعُونٌ من أتى امْرَأَتَهُ في دُبُرِهَا). واتە: نەفرەت لێکراوە ئەوکەسەی لە دواوە دەچێتە لای ژنەکەی.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:( من أتى حَائِضًا أو امْرَأَةً في دُبُرِهَا أو كَاهِنًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ على مُحَمَّدٍ )[٣] . واتە: هەرکەسێك بچێتە لای ئافرەتێك لە سووڕی مانگانەدابیٚ، یا ئافرەتێك لە دواوە، یا فاڵگرێك ئەوە بیٚ باوەڕ بووە بەوەی کە دابەزیوە بۆسەر (محمد) ﷺ.

---

[٣] – الترمذي (١٣٥) وصححه الشيخ الألباني .

هەرکەسێك جیماع لەگەڵ ژنەکەیدا بکات لە کاتی سووڕی مانگانەدا، یا لە دواوە بچێتە لای ئەوە نەفرەتی لێ کراوە و ئەو سزا توندە دەیگرێتەوە، بەهەمان شێوە ئەوەی بچێتە لای جادوزگەرێك،یا ئەستێرە ناس و ئەو کەسەی کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەر شتێك ون ببێت دەیدۆزێتەوە، دەربارەی نادیارەکان( غیبیات ) قسە دەکات، پرسیاری لێ بکات و بەڕاستیشی بزانێت .

بەڕاستی زۆرێك لە نەفامان تووشی ئەم تاوانە بوون، ئەمەش بەهۆی شارەزا نەبوونیانە لە زانست و زانیاری .

پێویستە لە سەر مرۆڤ تەوبە بکات لەهەموو تاوانەکانی، داوا بکات لەخوای گەورە لێی خۆش بێت لەسەر ئەو تاوانانەی کە بە نەفامی ئەنجامی داوە، بۆ ئەوەی ئەو تەمەنەی ماویەتی بەخۆشبەختی تەواوی بکات .

# تاوانی دوازدەیەم

## ڕیبا( سوو وەرگرتن )

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً ﴾ (آل عمران: ١٣٠). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە سوو بەچەند قات و چەند بەرامبەر مەخۆن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰاْ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾(البقرة: ٢٧٥) . واتە: ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوکەوت ناکەن و ڕاست نابنەوە ( لە گۆڕدا ) مەگەر وەك ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت( هەر لە دونیادا سروشتی نین، لە قیامەتیشدا وەك شێت دەبن ) چونکە ئەوانە دەڵێن: کڕین و فرۆشتن وەك سوو وایە.

کاتێك خوای گەورە خەڵکی زیندوو دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا بە پەلە لە گۆڕەکانیان دەردەچن، ئیللا ئەو کەسانە نەبێت کە ڕیبا دەخۆن، ئەوانە هەڵدەستن و دەکەون وەك کەسێك کە ڤێ و پەرکەمی تووش بووبێ، چونکە کاتێك لە دونیادا ڕیبایان دەخوارد سکیان پێ گەورە دەکرد و قورس دەبوون ، بۆیە لە قیامەتدا ناتوانن هەستن وەك کەسێکی ئاسایی، ئەوانە هەرکە دەیانەوێت هەستن تا بگەن بەو خەڵکەی کە بە پەلە ڕێدەکەن بەڵام ناتوانن.

لە (ابن عمر) وە بە (مرفوع) هاتووە: ئەگەر خەڵکی بەدوای دینارو درهەم بکەون، کڕین و فرۆشتنی پێوە بکەن و دوای کلکی مانگاکانیان بکەون و واز بهێنن لە جیهاد کردن

لە پێناوی خوادا، خوای گەورە بەڵایەکیان بۆ دادەبەزێنێت لای نابات لەسەریان هەتا دەگەڕێنەوە بۆ ئایینەکەیان.

## بەش

## قەدەغەکردنی وەرگرتنی دیاری لە قەرزار

لە(ابن مسعود) وە - ڕەزای خوای لێ بێت - فەرمووی: ئەگەر قەرزت بەلای کەسێکەوە بوو شتێکی بە دیاری بۆ هێنای لێی وەر مەگرە چونکە ئەوە ڕیبایە.

( الحسن) - ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێت: ئەگەر قەرزت بەلای کەسێکەوە بوو ئەوەی لە ماڵەکەی دەیخۆی حەرامە. بە فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ ئەم وتەیە پشت ڕاست دەبێتەوە:( من شَفَعَ لِأخِيه بِشَفَاعَةٍ فَأَهْدَى له هَدِيَّةً عليها فَقَبِلَهَا فَقَدْ أتى بَابًا عَظِيمًا من أَبْوَابِ الرِّبَا) .واتە: ئەوەی تکاکاری بۆ براکەی بکات لەبری ئەوە دیاری وەربگرێت، ئەوە چووەتە دەرگایەکی گەورەوە لە دەرگاکانی ڕیبا .

# تـاوانی سیازدەیەم

## خواردنی ماڵی هەتیوو زوڵم لێکردنیان

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴾ ( النساء: ١٠). واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە ماڵی هەتیوان بە ناحەق و ستەم دەخۆن، بێگومان ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە دەبێتە ئاگر لە سکیاندا، لە قیامەتیشدا دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۖ ﴾( الانعام: ١٥٢). واتە: نزیك ماڵ و سامانی هەتیو مەکەون مەگەر بەچاکی و لە قازانجی نەبێت، هەتا ئەو کاتەی گەورە دەبێت و بە تەواوی پێ دەگات.

(السدي) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت – لە ڕاڤەی ئەم دەقەدا دەڵێت: ئەوکەسەی ماڵ و سامانی هەتیو دەخوات بە ناحەق لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەکرێتەوە و ئاگر لە دەم و لوت و گوێ و چاوی دەردەچێت، هەرکە خەڵکی تەماشای دەکەن دەزانن ئەوە ماڵی هەتیوی خواردووە .

زانایان: دەڵێن: هەر بەخێوکەرێکی هەتیو ئەگەر هەژار بوو دەتوانێت لەو ماڵە بخوات بە پێی پێویست و هەستانی بەئەنجامدانی کاروباری هەتیوەکە، ئەوەی لەسەرووی ئەمەوە بێت ئەوە حەرامە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴾( النساء: ٦) . واتە: ئەوەی دەوڵەمەندە با دەستی بپارێزێت و ئەوەش کە هەژارە با لێی بخوات و لە سنوور دەرنەچێت و زیادەڕەوی نەکات، جا کاتێك ماڵ و سامانەکانیان تەسلیم دەکەنەوە ئەوە شایەتیان لەسەر بگرن ( هەرچەندە ) تەنها خوا بەسە بۆ لێپرسینەوەو چاودێری.

دەربارەی خواردنی ماڵی هەتیو (إبن الجوزي) (١) لە تەفسیرەکەیدا چوار بۆچوون و وتەی گواستوەتەوە:

یەکەم: وەرگرتنی بە مەبەستی قەرز.

دووەم: بەپێی پیویست لە ماڵی هەتیو بخوات بەبێ زیادە ڕەویی( إسراف ).

سێیەم: دەبێت بەئەندازەی ماندووبوونی خۆی بخوات .

چوارەم: بەپێی پێویست لێی دەخوات، ئەگەر باری ئابووری باش بوو ئەوە بۆی دەگەڕێنێتەوە، ئەگەر نا ئەوە بۆی حەلاڵە .

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أنا وكَافِلُ الْيَتِيمِ في الْجَنَّةِ هَكَذَا ). واتە: من بەخێوکەری هەتیو لە بەهەشتدا بەم شێوەین . ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوڕاست کردووە.

وە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە:( أنا وكَافِلُ الْيَتِيمِ له أو لِغَيْرِهِ أنا وهو كَهَاتَيْنِ في الْجَنَّةِ وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى أنا وكافل اليتيم له ولغيره أنا وهو كهاتين في الجنة)[1] . واتە: من و خاوەن یا بەخێوکەری هەتیوو کە منداڵی خۆی بێت یا جگە لە خۆی لە بەهەشتدا، وەك ئەم دوو پەنجە پێکەوەین . ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمان و پەنجەی ناوڕاست کرد.

دەستەبەرکردنی هەتیو ئەوەیە کە هەستێ بەنجامدانی ئەو کارانەی کە لە بەرژەوەندی ئەودایە لە خواردن و خواردنەوەو گەشەکردنی سامانی، ئەگەر پارە هەبوو، بەلاَم ئەگەر سامان نەبوو دەبێت خەرجی و جل و بەرگی بۆ دابین بکات، وشەی ( له ولغيره ) واتە: یەکسانە ئەگەر هەتیوەکە خزم بوو یان بێگانە .

---

[1] – ومسلم(٢٩٨٣).

کەفالەتی خزم بۆ هەتیو بریتیە لە: باپیرە یا برای یا دایکی یا مامەی یا پیاوی دایکی یا خالۆی یا هەر خزمێکی تری بێت .

بێگانە: ئەوکەسەیە کە هیچ پەیوەندیەکی خزمایەتی لە نیوانیاندا نەبێت .

پیاوێك بە ( أبو درداء ) ی وت: ئامۆژگاریم بکە؟ فەرمووی: بەزەییت بەهەتیودا بێتەوە و لەخۆتی نزیك بکەرەوە، ئەوەی خۆت دەیخۆی بیدە بە ئەویش .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( السَّاعِي على الْأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ). واتە: ئەوکەسەی خزمەتی بێوەژن و هەژاران دەکات وەکو موجاهیدێك وایە لە پێناوی خوادا .

# تـاوانی چواردە

## درۆکردن بە نـاوی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەیﷺ

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ﴾(الزمر: ٦٠). واتە: جا ڕۆژی قیامەت دەبینیت، ئەوانەی درۆیان بەناوی خواوە دەکرد( شتی نارەوایان تێکەڵی دین دەکرد ) ڕوخساریان ڕەش و تاریکە.

(الحسن) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێت: ئەوانە ئەو کەسانەن کە دەڵێن: ئەگەر بمانویستایە دەمانکرد، وەئەگەر بمانویستایە نەماندەکرد.

(ابن الجوزي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: هەندێ لەزانایان پێیان وایە درۆ کردن بەدەم خوای گەورەو پێغەمبەرەوە کوفرە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەردەچێت، گومانی تێدا نیە درۆ کردن بەدەم خوای گەورەو پێغەمبەرەوە لە حەلاڵ کردنی حەرام و حەرام کردنی حەلاڵ کوفر و بێ باوەڕیەکی ڕاستەقینەیە، مەبەست لەم باسەدا تەنها ئەوەیە درۆ کردنە جگە لەوە(١).

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( من كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ من النَّارِ).

واتە: هەرکەس بە مەبەست درۆ بەدەم منەوە بکات با جێگا بۆ خۆی خۆش بکات لە ئاگردا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من حَدَّثَ عَنِّي بِحَدِيثٍ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الْكَذَّابِينَ ). واتە: هەرکەسێك قسەیەك دەربارەی من بڵێت و بزانێت ڕاست نیە، ئەوە یەکێکە لە درۆزنان.

هەوەها فەرموویەتی: ( إنَّ كَذِباً علي، ليس كَكَذِبٍ على أحَدٍ فَمَنْ كَذَبَ علي مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ ). واتە: بێگومان درۆ كردن بەدەم منەوە، وەك درۆ كردن نی یە بەدەم هیچ كەسێكی ترەوە، جا هەركەس درۆ بەدەم منەوە بە ئەنقەست بكات با شوێنی خۆی ساز بكات لە ئاگردا .

هەوەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَن يَقُلْ ما لم أقُلْ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ )[1].

واتە: هەركەس بەدەم منەوە شتێك بڵێت كە من نەموتبێت دەبا جێگای خۆی خۆش بكات لە ئاگردا .

[1] – البخاري( ١٠٩)، ومسلم(٣)

# تاوانی پازدە

## پشت هەڵکردن لە کاتی جەنگدا

دروست نیە بۆ موجاهیدی موسڵمان پشت هەڵبکات لە کاتی جەنگدا ئەگەر بەرامبەرەکەی دووبەرامبەر یان زیاتر بوو، مەگەر بۆ فێڵێك یا ڕۆشتنی بۆ لای کۆمەڵێکی تر، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَآءَ بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأْوَىٰهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴾ (الأنفال: ١٦) .واتە: هەرکەس لەو ڕۆژەدا ڕابکاتە دواوەو پشتیان تێبکات ئەوە بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی خوادا گەڕاوەتەوە و سەرەنجام جێ و ڕێگەی دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگەو سەرەنجامە، مەگەر مەبەستی بەکارهێنانی هونەری جەنگ بێت یاخود مەبەستی شوێن گۆڕین و جێ گۆڕین بێت بۆ لای دەستەیەکی تر.

وە لە(أبو هريرة) وە – ڕەزای خوای لێ بێت – وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ) قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ وما هُنَّ؟ قال:وَالتَّوَلِّي يوم الزَّحْفِ)

واتە: ( خۆتان لەو حەوت شتە بپارێزن کە لەناوبەرە ) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە چین؟ فەرمووی: ( .........وپشت هەڵکردن لە کاتی جەنگدا ).

وە لە (ابن عباس) وە – ڕەزای خوای لێ بێت – وتی: کاتێك کە ئەم دەقە دابەزی:﴿ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَٰبِرُونَ يَغْلِبُوا۟ مِائَتَيْنِ ﴾( الأنفال: ٦٥ ). واتە: ئەگەر بیست کەس خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسدا.

خوای گەورە بۆی دیاری کردن کە نابێت موسڵمان پشت لە جەنگ بکات، ئەگەر بیست بەرامبەر بە دووسەد بوو، پاشان ئەم دەقە دابەزی:﴿ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا۟

مِاْئَتَيْنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمْ أَلْفٌ يَغْلِبُوٓاْ أَلْفَيْنِ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾(الأنفال: ٦٦). واتە: جا ئەگەر سەد کەسی خۆڕاگر هەبێت لە ئێوە، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دووسەد کەسداو ئەگەر هەزار کەستان هەبێت، ئەوە زاڵ دەبن بەسەر دوو هەزاردا، ئەویش بە ویست و یارمەتی خوا، خوایش یارو یاوەری خۆڕاگرانە.

ئینجا بۆی ئاسان کردن کە نابێت پشت لە جەنگ هەڵبکەن ئەگەر ڕێژەی موسڵمان سەد بەرامبەر بە دوو سەد بوو[1].

[1] – البخاري(٤٦٥٢).

## تـاوانی شازدەیەم

## فیڵ و نا پاکی و زوڵمی ئیمام لە ژێردەستەکانی

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾(الشورى: ٤٢). واتە: بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴾ ( ابراهیم: ٤٢، ٤٣ ). واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئیماندار) وا گومان مەبە کە خوا بێ ئاگایە لەو کارو کردەوەیەی ستەمکاران دەیکەن، بەڕاستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانیان تیایدا ئەبڵەق دەبن. بە پەلەو شپرزەییەوە دێن، سەریان بەرز کردۆتەوە و لە ترس و سامناکی ئەو ڕۆژەدا چاویان داناخرێت، دڵە ڕاوکێیانەو دڵ و دەروونیان بەتاڵە و هیچ حاڵی نین.

وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَسَيَعْلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَىَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ ﴾ (الشعراء: ٢٢٧). واتە: سەرەنجام ئەوانەی ستەمیان کردووە دەزانن کە بەچۆن تێکشکاویەك دەگەڕێنەوە بۆ لای خواو چۆن ژێرەو ژوور دەبن و تیادەچن.

هەروەها دەفەرموێت:﴿ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾ (المائدة: ٧٩). واتە: ئەوانە قەدەغەی یەکتریان نەدەکرد لە خراپەو تاوانێك کە دەیانکرد، سوێند بێت بەخوا ئەوەی کە دەیکەن زۆر خراپ و ناپەسەندە !

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:( مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا). واتە: ئەوەی فێڵ و ناپاکی بکات لە ئێمە نیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يوم الْقِيَامَةِ ). واتە: ستەمکردن مایەی تاریکیە لە ڕۆژی دواییدا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤول عن رَعِيَّتِهِ )(٢). واتە: هەمووتان شوانن، هەمووتان بەرپرسیارن لەسەر شوانیەکەتان .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ما من عَبْدٍ استرعاه الله رَعِيَّةً فلم يَحُطْهَا بنصيحة، إلا لم يَجِدْ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ ). واتە: هەر بەندەیەك کە خوا خەڵکانێك بخاتە ژێر دەستەیەوە و ئەو سەرپەرشتیاریان بێت ئەگەر بەدڵسۆزی و چاکی کاریان جێ بەجێ نەکات، ئەوە بۆنی بەهەشت ناکات.

وە یەکێك لە دوعاکانی پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( اللهم من وَلِّي مِنْ أمْرِ هذهِ الأُمَّة شيئاً، رَفَقَ بهم فَارْفُقْ بِهِ، وَمَنْ شَقَّ عليهم فَشُقَّ عليه ). واتە: خوایە گیان ئەوەی کاروباری ئەم نەتەوە دەکەوێتە ژێر دەستی و لەگەڵیاندا نەرم و نیانە، نەرم و نیان بە لەگەڵیدا، وە ئەوەی دووبەرەکی دەخاتە نێوانیان، لەناوی ببە.

هەروەها پێشەوامانﷺ فەرموویەتی:(مَن أحْدَثَ في أمْرِنَا هذا ما ليس فيه فَهُوَ رَدٌّ ). واتە: هەرکەس شتێك دابهێنێت لەم دینەدا و لەدیندا نەبێت ئەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە .

هەروەها پێغەمبەرمانﷺ فەرموویەتی: ( مَنْ أحْدَثَ حَدَثًا أو آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أجْمَعِينَ، لَا يُقْبَلُ الله منه صَرْفٌ ولا عَدْلٌ ). واتە: هەرکەسێك خراپەکاریەك بکات یان پەنای خراپەکار بدات ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێ بێت، خوا هیچ پەرستش و عیبادەتێکی لێ وەرناگرێت نە فەرز و نە سوونەت.

هەروەها خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: ( من لَا يَرْحَمُ لَا يُرْحَمُ ). واتە: هەرکەس ڕەحم نەکات و میهرەبانی نەنوێنێت ، ڕەحمی پێ ناکرێت .

هەروەها پێغەمبەرمانﷺ فەرموویەتی: ( لَا يَرْحَمُ الله من لَا يَرْحَمُ الناس ). واتە: خوای گەورە بەزەیی بەکەسێدا نایەتەوە کە ئەو کەسە بەزەیی بەخەڵکدا نەیەتەوە

هەروەهاﷺ فەرموویەتی: (الْإِمَامُ الْعَادِلُ فِي ظِلِّهِ يوم لَا ظِلَّ إلا ظِلُّهُ ). واتە: پێشەواو سەرکردەیەکی دادپەروەر لە ژێر سێبەری عەرشی خوادا دەبێت کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێکی دیکە نیە .

هەروەهاپێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( الْمُقْسِطُون على مَنَابِرَ من نُورٍ: الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وما وَلُوا ). واتە: دادپەروەران لەسەر مینبەرێکی نوورین دان: ئەوانن کە دادپەروەرن لە دەسەلآت و ماڵی خۆیاندا و شتەکانی تریش .

وە کاتێك کە پێغەمبەرﷺ ( معاذ)ی نارد بۆ یەمەن فەرمووی: ( إِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ فإنه ليس بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ ). واتە: دەخیلە دادپەروەر بە لە ماڵەکانیاندا، وە بترسە لە نزای ستەم لێکراوان چونکە بێگومان لە نێوان ئەوان و خوای گەورەدا هیچ پەردەیەك نیە .

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ( إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ على الْإِمَارَةِ وَسَتَكُونُ نَدَامَةً يوم الْقِيَامَةِ). واتە: ئێوە زۆر بە پەرۆشن بۆ ئەمیری و سەرکردایەتی، ئەگەر چی لە قیامەتدا پەشیمانی لە دوایە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّا والله لَا نُوَلِّي هذا الْعَمَل أَحَداً سَأَلَهُ أو أَحَداً حَرَصَ عليه ). واتە: سوێند بەخوا ئێمە کەسێك ناکەینە بەرپرس لە دەسەڵاتدا کە خۆی داوای بەرپرسیارێتی بکات، یا کەسێك لەسەری سوور بێت .

# تاوانی حەڤدەیەم

## لووتبەرزی ( الكبر )

لووتبەرزی: بریتیە لە شانازی و لە خۆ بایی بوون و فیز زلی.

خوای گەورە دەفەرمویت :﴿ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴾ (غافر:٢٧). واتە: موساش وتی: بێگومان من پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خۆم کە پەروەردگاری ئێوەشە لە هەموو لووتبەرز و خۆبەزل زانێك کە باوەڕی بە ڕۆژی لێپرسینەوە نەبێت.

وەهەروەها خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ﴾ (النحل: ٢٣). واتە: بەڕاستی ئەو زاتە ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە لووتبەرزن و خۆیان بەگەورە دەنوێنن.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( بَيْنَمَا رَجُلٌ يَجُرُّ إِزَارَهُ من الْخُيَلَاءِ خُسِفَ بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ في الأرض إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ). واتە: کابرایەك بە کەش و فشەوە دامێنی دەخشاندو خۆی دەنواند، خوای گەورە بردی بە ناخی زەویدا، ئیتر تا ڕۆژی قیامەت هەر بەناخی زەویدا ڕۆدەچێت !.

یەکەم تاوان کە سەرپێچی خوای پێ کراوە لووت بەرزییە

خوای گەورە دەفەرمویت :﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤ ﴾ (البقرة:٣٤) . واتە: کاتێکیش بە فریشتەکانمان وت: سوژدە بەرن بۆ ئادەم سوژدەیان برد، جگە لە ئیبلیس نەبێت کە سەرپێچی کرد و خۆی بەگەورە زانی و خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ الناس ). واتە: خۆ بەزل زانین شاردنەوەی حەق و ڕاستی یە و، بەسوك تەماشاكردنی خەڵكە.

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أحدٌ في قَلْبِه مِثْقَالُ ذَرَّةٍ من كِبْرٍ ). واتە: هیچ كەسێك ناچێتە بەهەشتەوە كە توزقاڵە گەردیلەیەك لووت بەرزی لە دڵیدا هەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ ( لقمان:١٨) . واتە: بەڕاستی خوا ئەوكەسانەی خۆش ناوێت كە خۆهەڵكێش و فەخر فرۆش و فیزاوین.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( اخْتَصَمَتْ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، فقالت الْجَنَّةُ: ما لي لَا يَدْخُلُني إلا ضُعَفَاءُ الناس وَسَقَطُهُمْ ؟ وَقَالَتْ النَّارُ : أُوثِرْتُ بِالجبَّارين بِالْمُتَكَبِّرِينَ ). واتە: بەهەشت و دۆزەخ كەوتنە مشت و مڕ، بەهەشت وتی: ئەوە چییە كەس نایەتە ناو منەوە جگە لە لاوازو بێ دەسەڵاتەكان نەبێت؟ ئاگریش وتی: بەشی منیش تەنها ستەمكارو لووت بەرزانە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾( لقمان:١٨) . واتە: هەروەها ڕووت وەرمەگێڕە لە خەڵكی و بەسەر زەویدا بەنازو فیزەوە مەڕۆ، بەڕاستی خوا ئەوكەسانەی خۆش ناوێت كە خۆهەڵكێش و فەخر فرۆش و فیزاوین.

(سلمة)ی كوڕی (الأكوع) دەڵێت: پیاوێك لە خزمەتی پێغەمبەرﷺ بە دەستی چەپی نانی خوارد، فەرمووی: ( بەدەستی ڕاستت بخۆ)، وتی: ناتوانم، فەرمووی: (بەڵكو ئەتوانیت، هیچ شتێك بەرهەڵستی نەكرد جگە لە خۆبەزل زانین نەبێ) دوای ئەوە نەیتوانی ئەو دەستەی ببات بۆ دەمی !.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( أَلا أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ النَّارِ، كُلُّ عُتُلٍ جَوَّاظٍ مُسْتَكْبِرٍ). واتە: ئایە هەواڵتان پێ بدەم بە دانیشتوانی دۆزەخ؟ هەموو دڵڕەق و سەختگیر و خۆبەزلزانن .

خراپترین جۆری لووت بەرزی ئەوەیە کە کەسێك بەهۆی زانست و چاکەوە خۆی بە گەورە بزانێت، ئەم کەسە هیچ سوودی لە زانستەکەی وەرنەگرتووە، بێگومان ئەوەی زانست فێر بێت بۆ دوارۆژوو قیامەتی، ئەو زانستە وای لێ دەکات نەرم و نیان و ڕۆح سووك و خۆبەکەم زان بێت، بەردەوام لەگەڵ نەفسیدا لە بەربەرەکانی بێت و لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات، چونکە نەفس ئەگەر لێپرسینەوەی لەگەڵ نەکرێت لە ڕێگەی ڕاست دەردەچێت .

وە ئەوەی زانست بخوێنێت بۆ شانازی پێکردن و دەسەڵات و خەڵك بەکەم زانین، بەڕاستی ئەمە گەورە ترین لووت بەرزیە ، ناچێتە بەهەشتەوە هەرکەسێك بەقەدەر تورزقاڵە گەردیلەیەك لووت بەرزی لە دڵیدا هەبێت.

# تاوانی هەژدەیەم

# شایەتی دان بە درۆ

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴾(الفرقان:٧٢) . واتە: ( بەندەكانی خوای میهرەبان) ئەوانەشن كە شایەتی ناحەق نادەن، هەرگیز لە شوێنێكدا ئامادە نابن كە شایەتی ناحەقی تێدا ئەنجام دەدرێت یان درۆی تیادا بكرێت، كاتێكیش بەلای گەمەو گاڵتەی نەفاماندا تێدەپەڕن، بەهێمنی وبە لەسەرخۆیی و سەربەرزییەوە تێدەپەڕن.

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴾ (الحج: ٣٠) . واتە: هەروەها لە گوفتاری درۆ و قسەی هەڵبەستراو خۆتان بە دووربگرن.

شایەتیدانی درۆ چەندین تاوانی تر بەدوای خۆیدا دەهێنێت لەوانە:

یەكەم: درۆ بەدەمەوە كردن،خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾( غافر:٢٨) . واتە: بەڕاستی خوا هیدایەت و ڕێنموویی كەسێك ناكات زیادەڕۆن و درۆ زۆر دەكەن .

دووەم: ئەوە ستەمە كە بەهۆی شایەتی دان لەسەر كەسێك ماڵ و سەروەتی ئەو كەسە بۆ خۆت حەلاڵ دەكەی .

سێ یەم: ئەو ستەمە كە بە هۆی ئەو شایەتی دانەوە ماڵی كەسێك بۆ كەسێكی تر حەلاڵ دەكات.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( فَمَنْ قَضَيْتُ له بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ من النَّارِ فَلْيَأْخُذْهَا أو فَلْيَتْرُكْهَا ). واته: جا هەرکەس حەقی موسڵمانێکم بۆ دابڕی کە مافی خۆی نەبوو، ئەوە پارچەیەك لە ئاگری بۆ دائەبڕم جا ئیتر کەیفی خۆیەتی با وەری بگرێت یا وازی لێبهێنێت .

چوارەم: بەو شایەتیدانە ڕێ بەکارێك دەدات کە خوای گەورە حەرامی کردووە لە ماڵ و خوێن و ئابروو،پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (( ألا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلَاثًا ؟ ) ........ منها : ( ألا وَقَوْلُ الزُّورِ، قال: فما زَالَ يُكَرِّرُهَا حتى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ (١). واته: شایەتی ناهەق، هەر بەردەوام دووبارەی دەکردەوە هەتا وتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو!.

## تـاوانی نۆزدەیەم

## خواردنەوەی مەی ( عارەق )

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ (المائدة: ٩٠،٩١) . واتە : ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن كە عەرەق و قومار و گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی كە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج و حەرام و حەڵاڵ زانین بە هۆی هەڵدانی زارەوە، ئەمانە هەر پیسن و لە كارو كردەوەی شەیتانن، كەواتە ئێوەش خۆتانی لێ بە دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازی و بەختەوەری بەدەست بهێنن( لەهەردوو جیهاندا ).بەڕاستی شەیتان هەر دەیەوێت لە ڕێگەی عارەق و قومارەوە دوژمنایەتی و بوغزو كینە بخاتە نێوانتانەوە و لە یادكردنی خوا و ناوە پیرۆزەكانی وێڵتان بكات، هەروەها سست و تەمبەڵتان بكات لە ئەنجامدانی نوێژەكان بە شێنەیی، ئایا ئیتر بەس نیە؟ ئایا كۆڵ نادەن؟! ( جا هەر كە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، جاڕ درا بە ناو شاری مەدینەدا كە عارەق حەرام كراوە، ئەوسا ئیمانداران قەڕابە و گۆزە و دیزە و هەرچی عارەقی تیادا بوو ڕشتیانە كۆڵان ) .

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾( النساء: ١٤) . واتە : (بەڵام) ئەوەی یاخی بێت لە خوا و پێغەمبەرەكەی و دەرچێت لە سنوورەكانی، ئەوە خوا دەیخاتە ناو ئاگرێكەوە كە بۆ هەمیشە تیایدا دەمێنێتەوە و سزایەكی سەر شۆڕكەر و ڕیسواكەری بۆ هەیە .

بێگومان مەی دایکی هەموو تاوانەکانە، بێگومان نەفرەت کراوە لەو کەسەی کە دەیخواتەوە لە چەندین فەرموودەدا هاتووە، لە ( ابن عمر) - ڕەزای خوایان لێ بێت – وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ، وَمَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا فَمَاتَ وهو يُدْمِنُهَا لم يَتُبْ لم يَشْرَبْهَا فِي الْآخِرَةِ ). واتە: هەموو مەستکەرێك بە مەی دادەنرێت، هەموو مەیەك حەرام و قەدەغەیە، ئەوەی لە دونیادا مەی بخواتەوەو ڕاهاتبێ لەسەری و بمرێت و تەوبە نەکات هەرگیز لە ڕۆژی دواییدا نایخواتەوە.

وە لە ( جابر) وە – ڕەزای خوای لێ بێت – وتی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : ( إِنَّ على اللَّهِ عز وجل عَهْدًا لِمَنْ يَشْرَبُ الْمُسْكِرَ أَنْ يَسْقِيَهُ من طِينَةِ الْخَبَالِ) قالوا: يا رَسُولَ اللَّهِ وما طِينَةُ الْخَبَالِ ؟ قال: ( عَرَقُ أَهْلِ النَّارِ أو عُصَارَةُ أَهْلِ النَّارِ ). واتە: خوای گەورە پەیمانێکی لەسەرخۆی واجب کردووە بۆ ئەو کەسەی کە مەی دەخواتەوە، دەبێ قوڕاوی ( الخبال ) بخواتە وە وترا: ئەی پیغەمبەری خوا قوڕاوی(الخبال) چییە؟ فەرمووی: ئارەقی خەڵکی ناو دۆزەخە،یا کێمی خەڵکی ناو دۆزەخە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( من شرب الخمر في الدنيا ثم لم يتب منها، حرمها في الآخرة ). واتە: ئەوەی لە دونیادا مەی بخواتەوە، پاشان تەوبەی نەکردبێت لێی، لە ڕۆژی دوایی لێی بێ بەش دەکرێت.

مەی خۆری هەمیشەیی ئەگەر پێش مردن تەوبەی نەکرد ، دەچێتە دۆزەخ

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لا يَدخُلُ الجَنَّةَ عَاقٌّ ولا مُدمِنُ خَمْرٍ )[1] . واتە: ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك دڵی دایك و باوك ئازار بدات، وەکەسێك بەردەوام بێت لەسەر مەی خواردنەوە .

[1] – النسائي( ٥٦٧٢)، وصححه الشيخ الألباني .

**ئەوەی مەی دەخواتەوە لە کاتی خواردنەوەدا بڕوادار نیه**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ولا يَسْرِقُ السَّارِقُ حين يَسْرِقُ وهو مُؤْمِنٌ،وَ لَا يَزْنِي الزَّانِي حين يَزْنِي وهو مُؤْمِنٌ، ولا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حين يَشْرَبُهَا وهو مُؤْمِنٌ ).

واته: دز لە کاتی دزیکردنەکەیدا باوەڕدارنابێت، زینا کار لە کاتی زینا کردنەکەدا باوەڕدارنا بێت،مەیخۆر لە کاتی مەیخواردنەوەکەیدا باوەڕدارنابێت ).

**ئەو کەسانەی کە نەفرەتیان لێکراوە بەهۆی خواردنەوەی مەیەوە**

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لَعَنَ الله الْخَمْرَ وَلَعَنَ شَارِبَهَا وَسَاقِيَهَا وَعَاصِرَهَا وَمُعْتَصِرَهَا وَبَائِعَهَا وَمُبْتَاعَهَا وَحَامِلَهَا وَالْمَحْمُولَةَ إليه ). واته: خوای گەورە نەفرەتی کردووە لە مەی وئەوەی دەیخواتەوە، ئەوەی دەیگێڕێت و ئەوەی دەیگوشێت و ئەوەی بۆی دەگوشن، ئەوەی دەیفرۆشێت و دەیکڕێت و، ئەوەی باری دەکات و ئەوەی بۆی بار دەکەن .

**مەی دروست نیە چارەسەری نەخۆشی پێ بکرێت**

لە(أم سلمة ) وە – ڕەزای خوای لێ بێت – وتی: کچێکم ئازاری هەبوو لە گۆزەیەکدا مەیم بۆ دروست دەکرد، لەو کاتەداپێغەمبەرﷺ هاتە ژوورەوە، بەسەر ئاگرەوە بوو، فەرمووی: ئەمە چیە ئەی دایکی ( سلمة؟) منیش وتم دەمەوێت کچەکەمی پێ چارەسەر بکەم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ( إن الله تعالى لم يجعل شفاء أمتي فيما حرم عليها)(١) واته: بەڕاستی خوای گەورە چارەسەری ئوممەتەکەمی لە شتێکی حەرامدا دانەناوە .

## بەش

ئەو حەشیشەی کە دروست دەکرێت لە گەڵای (القنب)، حەرامە وەك مەی خاوەنەکەی دەبێ حەددی شەرعی لێ بدرێت، بێگومان خراپترە لە مەی، لەو ڕووەی کە ئەقڵ و ئارەزوو بەتەواوەتی لەناو دەبات هەتا ئەو پیاوە وەك ئافرەتانی لێدێت، یا توانای نامێنێت بەسەر ماڵ و منداڵیداو، وە چەندین شتی خراپی تر، مەی خراپترە لەو ڕووەی کە دژایەتی و کوشتار بڵاو دەکاتەوە، هەردوو لە یادی خوا و لە نوێژ دوورمان دەخاتەوە.

هەندێ لە زانایانی (خلف) سزایان بۆ ئەو تاوانە دیاری نەکردووە، بڕوایان وایە ئەوەی بەکاری دەهێنێت تەنها سەرزەنشت دەکرێت، بۆیە گومانیان وایە ئەمە ئەقڵ دەگۆڕێت بەبێ بەکار هێنانی بەزم و ڕەزم وەك بەنج کردن وایە، زانایانی پێشین قسەیان لەسەر ئەم بابەتە نەکردووە، بێگومان ئەوەی دەیخواتەوە یان بەکاری دەهێنێت و ئالودەی دەبێت وەك خواردنەوەی مەی وایە بەڵکو زیانی زیاترە، هەتا وای لێ دەکات ئارام ناگرێ لەسەری ( واتە لەکاتی نەمانی مادەکە) تا لە یادی خوا و نوێژکردن دووری دەخاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا حەیاو حورمەتی لەدەست دەدات و توانای پیاوەتی و ئارەزو و ئەقڵی لەناو دەبات، جگە لەمانە چەندین زیان و ئاسەواری خراپ بەجێ دەهێڵێت .

بەڵام کاتێك کە دەبینرێت ئەو ماددەیە شلەمەنی نیە و وشکە وەك خواردن بەکاردەهێنرێت، زانایانی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد و جگە لەوانیش سێ ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوەی پیسە یان پاکە:

یەکەم: پیسە وەك مەی، ئەم بۆچوونە ڕاست و پەسەندە،

دووەم: پیس نیە چونکە بەستووە و شلەمەنی نیە.

سێیەم: جیاوازی دەکرێت لە نێوان ئەوەی کە بەستووەو ئەوەی کە شلەمەنییە.

بەهەر حاڵ ئەوە یەکێکە لەوانەی کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی حەرامی کردووە وەك مەی وایە لە ڕووی زمان و ماناوە.

لە (أبو موسی) وە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: فتوامان بۆ بدە دەربارەی ئەو دوو شەرابەی كە خۆمان لەیەمەن دروستی دەكەین، یەكەمیان ( البتع) ئەوەش لە هەنگوین دروست دەكرێت، دادەنرێت هەتا ڕەنگی دەگۆڕێت، وە(المزر) ئەوەش گەنمەشامی و جۆیە دەمێنێتەوە لە گەڵ ئاودا هەتا دەگۆڕێت، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر قسەی بكردایەت قسەكانی كورت و پڕ مانا بوو،پێغەمبەر فەرمووی( ( أَنْهَى عَنْ كُلُّ مُسْكِرٍ أَسْكَرَ عَنِ الصَّلاةِ )[1]. واتە: من هەموو مەستكەرێك كە بێ ئاگات بكات لە نوێژ قەدەغەی دەكەم.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ما أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ )[2]. واتە: ئەو شتەی كە زۆرەكەی بێ هۆش بكات كەمەكەی حەرامە .

جیاوازی نیە لە نێوان ئەو جۆرەی كە دەخورێتەوە یان دەخورێت، چونكە هەندی جار مەی شتی لێ دروست دەكرێت، وەك نان .

وە ئەو حەشیشەش هەندێ جار لەنا ئاودا دەتوێنرێتەوە و دەخورێتەوە، بەهەمان شێوەش مەی دەخورێت، بەهەمان شێوە حەشیشەش دەخورێت و دەخورێتەوە، ئەی بۆچی زانایانی پێشین باسیان نەكردووە، چونكە لەسەردەمی ئەواندا نەبووە، بەڵكو لەگەڵ هاتنی تەتەر (مەغول) كاندا ئەم كارەیان هێنا بۆ وڵاتی ئیسلام، لە پیاهەڵدانیدا هۆنراوەیەك وتراوە:

فأكلها وزارعها حلال فتلك على الشقي مصيبتان

واتە:

خواردنی و چاندنی حەڵاڵە ئا ئەوە بۆ نەگبەت دوو كارەساتە

---

[1] – مسلم(١٧٣٣).

[2] – أبو داود(٣٦٨١)، والترمذي(١٨٦٥)، والنسائي(٥٥٩٨)، وابن ماجه(٣٣٩٢)، وصححه الشيخ الألباني .

وە وتراوە:

قل لمن يأكل الحشيشة جهلاً عشت في أكلها بأقبح عيشة

قيمة المرء جوهر فلمـــاذا يا أخا الجهل بعته بحشيشة

واتە:

بەو كەسە بڵێ كە بە نەفامی حەشیشە دەخوات لە خواردنیدا خراپترین ژیانت بەسەر برد

نـرخـــی مـــرۆڤ گـــەوهەرە ئەی بـــۆچی ئەی برای نـــەزان بە حەشیشە فرۆشتت

چارەشەر بۆ ئەو كەسەی كە گیرۆدەی ئەم نەخۆشیە بووە ئەوەیە كە پەشیمان بێتەوەو بگەڕێتەوە بۆ جێبەجێكردنی فەرمانەكانی خوای گەورە .

# تاوانی بیستەم

## قومارکردن

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾( المائدة: ٩١،٩٠) . واتە: ئەی ئەوکەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومار و گۆشتی ماڵاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵك بە پیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج و حەرام و حەلاڵ زانین بە هۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەر پیسن و لە کارو کردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن( لەهەردوو جیهاندا ).بەڕاستی شەیتان هەر دەیەوێت لە ڕێگەی عارەق و قومارەوە دوژمنایەتی و بوغزو کینە بخاتە نێوانتانەوە و لە یادکردنەوەی خوا و ناوە پیرۆزەکانی وێڵتان بکات، هەروەها سست و تەمەڵتان بکات لە ئەنجامدانی نوێژەکان بە شێنەیی، ئایا ئیتر بەس نیە؟ ئایا کۆڵ نادەن؟! ( جا هەر کە ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە، جاڕ درا بە ناو شاری مەدینەدا کە عارەق حەرام کراوە، ئەوسا ئیمانداران قەڕابە و گۆزە و دیزە و هەرچی عارەقی تیادا بوو ڕشتیانە کۆڵان ) .

(المیسر) : بریتیە لە هەموو جۆرەکانی قومار: زاری تاوڵە یا شەترەنج یا هێلکە یا بەرد یا هەر شتێکی تر.

ئەوەش بریتیە لە خواردنی ماڵی خەڵك بەناحەق کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە. وەك دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ وَتُدۡلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلۡحُكَّامِ لِتَأۡكُلُواْ فَرِيقٗا مِّنۡ أَمۡوَٰلِ

ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾( البقرة: ١٨٨) .واتە: نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر لە نێوانتاندا بە ناحەق بخۆن، نەکەن هەندێکی بدەن بە کاربەدەستان بۆ ئەوەی هەندێك ماڵی خەڵکی بخۆن لە ڕێگەی ناحەق و گوناهەوە، لە کاتێکدا خۆشتان دەزانن کە ئەو کارە ڕەوا نیە.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّ رِجَالًا يَتَخَوَّضُونَ فِي مَالِ اللَّهِ بِغَيْرِ حَقٍّ فَلَهُمْ النَّارُ يوم الْقِيَامَةِ ). واتە: ئەوانەی بەشێوەیەکی نا حەق و نا تەندروست هەڵسوکەوت بە ماڵی خوای گەورەوە دەکەن، بەشی ئەوان ئاگرە لە ڕۆژی دواییدا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( مَنْ قال لِصَاحِبِهِ تَعَالَ أُقَامِرْكَ فَلْيَتَصَدَّقْ). واتە: هەرکەسێك بە هاوڕێکەی وت: با قومار بکەین با خێر بکات.

جا ئەگەر تەنها بە وتنی( با قومار بکەین ) دەبێت خاوەنەکەی کەفارەت بدا یا خێر بکات، جا ئەو کەسەی کە بە کردار دەیکات دەبێت سزاو تاوانی چەندە گەورە بێت.

## بەش

زانایانی ئیسلام ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی یاریکردن بە تاوڵەو شەترەنج ئەگەر مەبەست پێی بارمتەو ڕەهن نەبێت، بەڵام یەك دەنگن لەسەر قەدەغەکردنی تاوڵە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ ). واتە: ئەوەی یاری بەزاری تاوڵە بکات وەك ئەوە وایە دەستی ڕەنگ کردبێ لە گۆشت و خوێنی بەرزدا.

بەڵام ( شەترەنج ) زۆربەی زانایان بڕوایان وایە یاری کردن پێی حەرامە، جا ئەگەر لەبەر شتێك بێت، یان بۆ خۆشی، بەڵام ئەگەر لەبەر شتێك بوو بەیەك دەنگ حەرامە، وە ئەگەر یاریەکە بۆ خوشی بوو ئەوە لای زۆربەی زانایان حەرامە، بەڵام لە ئیمامی شافعیەوە هاتووە کە ئەگەر دەست بەتاڵ بوو ڕێگریی لە واجبێك نەگرت یا نوێژ لە کاتی خۆیدا بکات ئەوە موباحە و ئاساییە.

پرسیار کرا لە ئیمامی (النووي) - ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەربارەی یاریکردن بە شەترەنج ئایا حەرامە یان دروستە؟ فەرمووی: لای زۆربەی زانایان حەرامە.

هەروەها پرسیاری لێکرا دەربارەی یاریکردن بە شەترەنج ئایا دروستە یا دروست نیە؟ ئایا ئەو کەسە پێی تاوان بار دەبێت یان نا ؟ فەرمووی: ئەگەر بەو هۆیەوە نوێژێکی لەدەستدا لە کاتی خۆیدا، یا لەسەر شتێك یاری کرد ئەوە حەرامە، ئەگەر وانەبێ ئەوە باش نیە لای ئیمامی شافعی، وەحەرامە لای جگە لە شافعی.

بەڵگە لەسەر حەرام بوونی لەسەر قسەی زۆربەی زانایان هاتووە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ﴾(المائدة: ٣). واتە: لە سەرتان حەرام کراوە خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو،وە خوێن، گۆشتی بەراز، هەروەها ئەو ماڵاتەش کە سەر دەبڕدرێن و ناوی غەیری خوای لەسەر دەبرێت هەروەها ماڵاتی خنکاویش، ئەوەش کە بە ئازارو لێدان مردار بۆتەوە، ئەوەش کە دەکەوێتە خوارەوە، ئەوەش کە بە لێدانی ماڵاتێکی تر مردار بووبێتەوە، ئەوانەش کە دڕندە پەلاماری دابن و لێی خواردبن مەگەر فریای چەقۆ کەوتبن، هەروەها حەرام کراوە خواردنی گۆشتی ئەو ماڵاتانەی لەو شوێنانەدا سەر دەبڕێن کە هاناو هاواری بۆ غەیری خوا تێدا دەبرێت، هەروەها حەرامە لەسەرتان داوا کردنی چارەنووستان بە هۆی( الأزلام) وە وەکو ئەو شتانەی کە لە ڕێگەی هەڵدانی زارەوە دەست بکەوێت هەروەها فاڵگرتنەوە و بورجەکان و قاوە گرتنەوە، ........ هتد ).

ئیمامی(علي) کوڕی ( ابي طالب) - ڕەزای خوای لێ بێت - فەرموویەتی: شەترەنج قوماری عەجەمەکانە، وە ئیمامی (علي) تێپەڕی بەلای خەڵکێکدا یاری شەترەنجیان دەکرد فەرمووی: ئەم پەیکەرانە چیە بەدیاریەوە خووتان پێوە گرتووە، ئەگەر پارچەیەك

ئەسكڵ بگرن بە دەستەوە هەتا دەكوژێتەوە، باشترە لەوەی ئەوە بگرن بەدەستانەوە، سوێند بەخوا ئێوە بۆ ئەمە دروست نەكراون.

پرسیار كرا لە (إبراهيم النخعي)؛ چی دەڵێیت دەربارەی یاریكردن بە شەترەنج؟ وتی: نەفرەت لێ كراوە.

ئەمەش وەك ئەوە وایە كەسێكی تر هاورێیەتی كۆمەڵە مەی خۆرێك بكات دابنیشێ لەگەڵیاندا كاتێك كە سەرە مەرگی دێت كەسێك بێت بۆ لای بڵێ شایەتمان بێنە، ئەویش پێی بڵێ تۆزی مەیم بدەرێ و پاشان بمرێت، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( يَمُوتُ كُلُ إِنْسَانٍ على ما عَاشَ عَلَيْهِ، وَيَبْعثُ على ما مَاتَ عَلَيْهِ ). واتە: هەموو كەسێك لەسەر ئەوە دەمرێت كە لەسەری ژیاوە، وەلەسەر ئەوەش زیندوو دەكرێتەوە كە لەسەری دەمرێت .

# تاوانی بیست و یەك

# تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی داوێن پاك

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ لُعِنُوا۟ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ (النور: ٢٣،٢٤) . واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئافرەتانی ئیمانداری داوێن پاك و خاوەن و مێرد و بێ ئاگا لە گوناه،تۆمەتبار دەکەن، ئەوانە نەفرینیان لێکراوە لە دونیاو قیامەتدا و سزایەکی گەورە و سەخت ئامادەیە بۆیان ( لە تۆڵەی لەکەدارکردنی پاکاندا ) .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا۟ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجْلِدُوهُمْ ثَمَٰنِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾( النور:٤) . واتە: ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و خاوێن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتییان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبار و لە سنوور دەرچوو و یاخیەکاندان .

خوای گەورە ڕوونی کردوەتەوە کە هەرکەسێك ئافرەتێکی داوین پاك تۆمەتباربکات بە زینا و داوێن پیسی ئەوە لە دنیادا نەفرینی لێ دەکرێت و لەدواڕۆژیشدا سزایەکی گەورە و بەئێشی بۆ ئامادەیە، وە لە دنیادا سزای ( الحد) ی لێ دەدرێت کە: هەشتا قامچی دەکات، جارێکی تر بەهیچ شێوەیەك شایەتی لێ وەرناگیرێت هەرچەندە ڕاستیش بڵێت .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(( خۆتان لەو حەوت کارە بپارێزن کە لەناوبەرن ) یەکێك لەوانە (تۆمەتبارکردنی ئافرەتانی داوێن پاك و بێ ئاگا لە بڕواداران.

القذف: واته: تۆمەتباركردنی ئافرەتێكی بێ ئاگای موسڵمان، وەك: ئەی زیناكەر، یا ئەی داوین پیس، یا ئەی قەحپە، یا بە ژنێك بڵێت ئەی حیز، یا بەمنداڵێك بڵێت: ئەی زۆڵ، یا كوڕ قەحپە، یا بە كچێك بڵێت: ئەی حیز، یا قەحپە، وشەی قەحپە بە مانای زیناكەر دێت.

ئەگەر پیاوێك ئەمە بەژنەكەی بڵێت یا ژن بە پیاوەكەی بڵێت، وەك بەپیاوێك بڵێت: ئەی زیناكەر، یا بەمنداڵێك بڵێت ئەی شووكردوو، ئەوە دەبێت سزای( الحد )ی لێ بدرێت هەشتا قامچی، مەگەر بەڵگەیەك بۆ ئەو تۆمەتە بهێنێت، ئینجا ڕزگاری دەبێت. وە بەڵگەش وەك چۆن خوای گەورە باسی كردووە دەبێت چوار شاهید بهێنێت شایەتی بدەن لەسەر ڕاستی و دروستی ئەو تۆمەتە جا ئەگەر ئافرەت بێت یان پیاو[١]، بەڵام ئەگەر بۆ تۆمەتەكەی بەڵگەی پێویستی نەهێنا، ئەوە داری( الحد )ی لێ دەدرێت.

بەهەمان شێوە ئەگەر خزمەتكارەكەی تۆمەتبار بكات وەك بڵێت: ئەی زیناكەر یا ئەی زینا لەگەڵ كراو، یا هەر وشەیەكی تر ئەم واتایە ببەخشێت، لە فەرموودەی پێغەمبەرداﷺ هاتووە كە فەرموویەتی: ( من قَذَفَ مَمْلُوكَهُ بالزِّنا أُقِيمَ عَلَيْهِ الحَدُّ يوم الْقِيَامَةِ إلا أنْ يَكُونَ كما قال ). واتە: ئەوەی خزمەتكارەكەی تۆمەتبار بكات بە زینا ئەوە لە ڕۆژی دوایدا داری( الحد )ی لێ دەدرێت، مەگەر ئەوەی وتویەتی ڕاست بێت ).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ من رِضْوَانِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لها بَالًا يرفع الله بها دَرَجَاتٍ وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ من سَخَطِ اللَّهِ لَا يُلْقِي لها بَالًا يهوى بها في جَهَنَّمَ ). واتە: جاری وا هەیە بەندەیەكی خوا وشەیەك دێ بە دەمیدا لە بەرخودا، هیچ بایەخێكی پێ نادا، خوای گەورە بە چەندین پلە بە هۆی ئەو وشەیەوە بەرزی دەكاتەوە،

---

[١] – ئیمامی زەهەبی ئاماژە دەكات بەو دەقەی خوای گەورە كە ئەفەرموێت: ( والذين يرمون المحصنات ثم لم يأتوا بأربعة شهداء فاجلدوهم ثمانين جلدة ولا تقبلوا لهم شهادة أبداً وأولئك هم الفاسقون) النور(النور:٤).

بەندەی وایش هەیە وشەیەك دێ بە دەمیدا، کە خودای لێی دەڕەنجێ و پێی ڕازی نییە، گوێ نادا بەو وشەیە، بەلاّم بەرەو دۆزەخ هەڵی دەدێرێ.

وە (معاذ ) کوڕی ( جبل) وتی:ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئێمە سزا دەدرێین لە سەر ئەو شتانەی کە دەیڵێین؟ پێغەمبەریش فەرمووی: ( ثَكلَتْكَ أُمُّكَ يا مُعَاذُ، وَهَلْ يَكُبُّ الناس في النَّارِ على وُجُوهِهِمْ - أو على مَنَاخِرِهِمْ - إلا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ )[1]. واتە: لە باری دایکت بچی ئەی (معاذ) ئایا ئەو خەڵکەی بە ناو دۆزەخدا لە سەر ناوچەوانیان ڕادەکێشرێن ئیللا دروێنەی زمانەکانیانە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە ( مَنْ كان يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أو لِيَصْمُتْ)[1] . واتە: هەرکەس بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە ئەوە با قسەیەکی باش بکات یان بێدەنگ بێت .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾( ق: ١٨) . واتە: هەر قسەیەك لە دەم دەرچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات .

---

[1] – الترمذي(٢٦١٦)، وابن ماجه(٣٩٧٣)، وصححه الشيخ الألباني.

[1] – البخاري(٦٨٥٨)، ومسلم(١٦٦٠).

## تـاوانی بیست و دوو

## شاردنەوەی دەسکەوت ( الغنیمة ) لە کاتی جەنگدا

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ ﴾( الانفال: ٥٨) . واتە : بەڕاستی خوا کەسانی پەیمان شکێن و ناپاکی خۆش ناوێت .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾( آل عمران: ١٦١) . واتە : ( هەندێك گومانیان برد کە پێغەمبەرﷺ لە دابەشکردنی دەسکەوتدا نادادی دەکات ) بێگومان بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە نادادی و خیانەت بکات، هەرکەس ناحەقی و نادادی بکات لە ڕۆژی قیامەتدا نادادییەکەی یەخەی پێ دەگرێت و بە کۆڵیەوەیەتی، لەوەو دوا پاداشتی هەرکەسێك بە گوێرەی کردەوەکانی دەدرێتەوە و ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێت .

لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە لە ( ابو هریرة ) – ڕەزای خوای لێبێت– دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەستایە سەر پێ و باسی ئەو شتانەی فەرموو کە خەڵکی لە دەستکەوتی جەنگ دەیشارنەوە بۆ خۆیان بە کارەساتی گەورە ناوزەندی کردو فەرمووی : با کەستان نەبینم لە دواییدا مەڕێکی ئالآندبێ لە ملی و هەر بارەی بێت یاخود ئەسپێك و هەر بحیلێنێت و بە من بڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش بڵێم : هیچم لە دەستدا نیە بۆت، من پێم ڕاگەیاندی، هەیە وشترێك بەسەر ملیەوەیەتی دەبۆڕێنێ، ئەویش دەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێم : هیچم لە دەستدا نیە بۆت، من کاتی خۆی پێم ڕاگەیاندی، هەیە کۆڵە زێڕو زیوی لە گەردندایەو دەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێم : هیچم لە دەستدا نییە بۆت، من کاتی خۆی پێم ڕاگەیاندی، یاخود

هەندێك قوماش و جلوبەرگی لە گەردندایە دەشكێتەوە، ئەویش دەڵێت : ئەی پێغەمبەری خوا فریام کەوە، منیش دەڵێم هیچم لە دەستدا نیە بۆت، من کاتی خۆی پێم ڕاگەیاندی[١]

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾. واتە: هەرکەس ناحەقی و نادادی بکات لە ڕۆژی قیامەتدا نادادییەکەی یەخەی پێ دەگرێت و)بە کۆڵیەوەیەتی.

بە هەمان شێوە پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە ( ابن اللتبية)ی نارد بۆ وەرگرتنی زەکات، کە گەڕایەوە وتی: ئەوە بۆ ئێوە، ئەمەش دیارییە دایانە بە خۆم، پێغەمبەرﷺ چووە سەر مینبەر و وەسفی خوای گەورەی کرد و دواتر فەرمووی:( والله لَا يَأْخُذُ أحَدٌ منكم شيئاً بغيرِ حَقّه إلا جاء يوم الْقِيَامَةِ يَحْمِلُهُ على رَقَبَتِهِ، فَلا أعْرِفُ رَجُلاً منكم لَقِيَ الله يَحْمِلُ بَعِيرًا له رُغَاءٌ أو بَقَرَةً لها خُوَارٌ أو شاه تَيْعَرُ، ثُمَّ رَفَعَ يده حتى رَأَيْنَا عُفْرَةَ إِبْطَيْهِ اللهم هل بَلَّغْتُ اللهم هل بَلَّغْتُ ). واتە: سوێند بەخوا هیچ کەس لە ئێوە شتێك وەرناگرێت بەناحەق ئیللا لە ڕۆژی دواییدا دێت بەسەر کۆڵیەوە، با کەسێك لە ئێوە نەبینم بچێتە خزمەت خوای گەورە و حوشترێك بەسەر کۆڵیەوە ناڵە ناڵی بێت یا مانگایەك ببۆڕێنی، یا بەرخێك بباڕێنێت ) پاشان دەستی بەرز کردەوە هەتا بن باڵیمان بینی ، ئینجا دووجار فەرمووی: ( خودایە گیان گەیاندم ).

لە (أبو هريرة) وە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: کاتێك کە دەرچووین بۆ غەزای خەیبەر لە گەڵ پێغەمبەر ﷺ سەرکەوتنمان بەدەست هێنا، بەڵام هیچ دەستکەوتێکمان بەدەست نەهێنا لە ئاڵتون و پارە، جگە لە کەلوپەل و پێویستی تر نەبێت، پاشان بەڕێکەوتین هەتا گەیشتین بە شیوەکە واتە: ( وادي القرى) وە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەندەیەك هەبوو کەسێك بەخشیبوی پێی لە هۆزی( جذام) پێی دەوترا:( رفاعة )ی کوڕی ( يزيد ) لە عەشیرەتی(بني الضبيب) بوو، کاتێك کە دابەزینە شیوەکە بەندەکە هەستا کاروانەکە ئامادە بکات، بەڵام لە لایەن دوژمنانەوە بە تیرێك پێکرا و گیانی لە دەستدا،

---

[١] – البخاري(٢٩٠٧).

وتمان خۆشبەختی بۆ ئەو کە پلەی شەهیدی بەدەست هێنا، فەرمووی: ( كَلَّا وَالَّذِي نَفْسِي بيده إِنَّ الشَّمْلَةَ لَتَلْتَهِبُ عليه نَارًا، أَخَذَهَا من الْغَنَائِمِ لم تُصِبْهَا الْمَقَاسِمُ ). وتە: نەخێر سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ، ئەو جل و بەرگەی دەبێت بە ئاگر و سزای پێ دەدرێت، کە لە دەست کەوتەکاندا بردوویەتی بەبێ دابەش کردن. وتی: خەڵکەکە پەشۆکا پیاوێك کە ئەمەی بیست هات قەیتانێك یا دووقەیتانی هێنا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە لە جەنگی خەیبەرم دەست کەوتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: قەیتانێك یا دوو قەیتانیش بۆ دۆزەخە.

**دەربارەی ئەم بابەتەدا فەرموودە زۆرە هەندێکی لە بەشی ستەمدا هاتووە ستەم کردن سێ بەشە:**

**یەکەم: خواردنی ماڵ بە ناحەق .**

**دووەم: ستەم کردن لە مرۆڤ بە کوشتن و لێدان و شکاندن و برینداركردن.**

**سێیەم: ستەم کردنی مرۆڤ بە تانە و جنێودان و نەفرەت و تۆمەت دانە پاڵ .**

(أبو بكرة) ڕەزای خوای لێ بێت - دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەسەر وشترێکەوە بوو وتاری دا، یەکێك ڕەشوەی وشترەکەی گرتبوو: فەرمووی:(ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟) ئێمەش بێدەنگ بووین هەتا وا گومانمان دەبرد کە ناوێکی تری لێ بنێت جگە لە ناوەکەی خۆی، فەرمووی: (ئایا ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنی قوربان نیە ؟) وتمان: بەڵێ، فەرمووی: ( ئەم مانگە چ مانگێکە؟ ) ئێمەش بێدەنگ بوین هەتا وا گومانمان دەبرد کە ناوەکەی بگۆڕێت، فەرمووی: ئایا (ذو الحجة) نیە؟ ) وتمان: بەڵێ، فەرمووی:( ألا إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هذا في شَهْرِكُمْ هذا في بَلَدِكُمْ )[1]. واتە: ئاگاداربن، خوێنتان، سامانتان، ناموستان، لە نێوانتاندا حەرامە وەکو حەرامی ئەم ڕۆژە و حەرامی ئەم مانگەو حەرامی ئەم شارە(مەکە)، دەبا ئەوەی لێرەیە ئاگاداری ئەوانە بکاتەوە کە لێرە نین .

[1] — البخاري(١٧٣٩)، ومسلم(١٢١٨).

# تـاوانی بیست و سێ

## دزی كردن

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾( المائدة: ٣٨) . واتە: دەستی پیاوی دزو ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی كاری ناڕەوایاندا، ئەمەش تۆڵەیەكە لە لایەن خواوە، خوا بالآدەست و دانایە ( لە بڕیاردانی ئەو سزایەدا، بێ گومان ئەم سزایە لە كۆمەڵگەی ئیسلامیدا جێبەجێ دەكرێت ، كاتێك هەموو كەسێك ژیانی مسۆگەرە و هەمووان دەستی یارمەتی بۆ یەكتر درێژ دەكەن، هەروەها لە ساڵانی گرانیدا دەست نابڕدرێت .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وهو مُؤْمِنٌ، ولا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وهو مُؤْمِنٌ، ولَكِن التَّوْبَةُ مَعْرُوضَةٌ )[1]. واتە: مەیخۆر لە كاتی مەیخواردنەوەكەیدا باوەڕدارنییە، دز لوكاتی دزیدا باوەردار نییە، بەڵام تەوبەش دەخرێتە پێش چاو بۆ هەموو كەسێك.

لە (ابن عمر) وە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەستی دزی بڕیوە لە دزینی زرێیەكدا كە نرخەكەی سێ درهەم بووە.

خاتوو(عائشة) دایكی ئیمانداران دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەستی دزی بڕیوە لە ڕوبعە دینارێكدا ( دووسەد و پەنجا فلس ) بەرەو سەرەوە .

---

[1] – سبق تخريجە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لا تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فيما دون ثَمَنِ الْمِجَنِّ ). واتە: دەستی دز نابڕێت، لە شتێكدا كە كەمتر بێت لە نرخی قەڵغان (المجن). (كەمتر نەبێت لە ( دە درهەم ).

المجن: ئەو زرێیەیە كە جەنگاوەر بەكاری دەهێنێت لە جەنگدا، گیانی خۆی پێ دەپارێزێت لە هێرشی دوژمن.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ الذي يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ ). واتە: نەفرەتی خوا لەو دزەی كە هێلكە دەدزێ و ئینجا دەستی دەبڕدرێت، وە حەبل دەدزێ و دەستی دەبڕدرێت.

لە (عائشة)وە دەڵێت: ئافرەتێكی مەخزومی هەبوو شتومەكی دەبرد و حاشای لێ دەكرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد بە بڕینی دەستی، ( أسامة) كوڕی( زید) هاتە لایماڵەوەیان قسەی لەگەڵیان كرد، ئینجا هاتەوە بە پێغەمبەری وت، پێغەمبەر پێی فەرموو: ( يا أُسَامَةَ ألاَ أرَاكَ تُكَلِّمُني في حَدٍّ من حُدُودِ اللهِ تَعالى، ( إنما أهْلَكَ مَن كَانَ قَبْلَكُمْ أنَّهُمْ كَانُوا إذا سَرَقَ فيهم الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وإذا سَرَقَ فِيهِمْ الضَّعِيفُ أقَامُوا عليه الْحَدَّ وأيم اللّهِ لو أنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا ). واتە: ئەی ئوسامە چیە دەتبینم دەتەوێت قسەم لەگەڵدا بكەیت دەربارەی سزایەك كە خودا دایناوە، پاشان هەستاوە سەر پێ و فەرمووی: بەڕاستی نەتەوەكانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە لەناو چوون، ئەوان ئەگەر پیاوێكی خاوەن پلەو پایە دزی بكردایە وازیان لێ دەهێنا، وەئەگەر پیاوێكی لاواز دزی بكردایە سزایان بەسەردا جێبەجێ دەكرد، سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر ( فاطمة)ی كچی محمد دزی بكات دەستی دەبڕم.

# تاوانی بیست و چوار

# بڕینی ڕێگا

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾( المائدة: ٣٣ ). واتە : بێگومان تۆڵەی ئەوانەی کە دەجەنگێن و دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و بە گەرمی هەوڵ دەدەن بۆ بڵاوکردنەوەی فەساد و بەد ڕەوشتی لە زەویدا هەر ئەوەیە : ( ئەوانەیان کە خەڵکیان کوشتووە ) دەبێت بکوژرێن، ( ئەوانەش کە خەڵکیان کوشتووە و جەردەییشیان کردووە ) دەبێت لە خاچ بدرێن، ( ئەوانەیان تەنها جەردەیی دەکەن ) دەست و قاچێکیان بە پێچەوانەوە ببڕدرێت، ( ئەوانەیان کە مەترسیان لێدەکرێت ) ئەوە شار بەدەر بکرێت، ئەو سزایە خەجاڵەتی و سەرشۆڕیە بۆیان لە دونیادا، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورەیان بۆ هەیە .

(الواحدي) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێت: واتای: ﴿ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ واتە: سەرپێچی دەکەن و گوێڕایەڵی ناکەن، وەهەرکەسێك سەرپێچیت بکات ئەوە دوژمنتە، ﴿ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا ﴾ مانای: کوشتن و دزیکردن و بردنی ماڵ و سامانە، هەرکەسێك چەك هەڵبگرێت لەسەر بڕواداران، ئەوە دوژمنی خواو پێغەمبەرەکەیەتی، ئەمەش وتەی ئیمامی مالیك و ئەوزاعی و شافعیی.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَن يُقَتَّلُوٓاْ ﴾ هەتا ﴿ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ﴾ ( ابن عباس) دەڵێت: (أو) بۆ هەڵبژاردنە بە واتای ( الإباحة) دێت بەئارەزووی ئیمام، ئەگەر ئیمام

بيەوێت دەيكوژێت، وەئەگەر بيەوێت هەڵيدەواسێت، وەئەگەر بيەوێت شاربەدەری دەكات، ئەمەش وتەی ( الحسن) و( سعيد ) كوڕی (المسيب) و(مجاهد).

وە لە ڕيوايەتی(عطية)دا (أو) بۆ (اباحة) نيە، بەڵكو بۆ جياوازی پلەی تاوانەكەيە، هەركەسێك كەسێك بكوژێت و ماڵەكەی ببات دەكوژرێت و هەڵدەواسرێت، وەهەركەسێك ماڵێك تاڵان بكات و خاوەنەكەی نەكوژێت، تەنها دەستی دەبڕدرێت، وەهەركەس تەنها خوێنی ڕشت و دەسكاری ماڵەكەی نەكرد دەكوژرێت، وەهەركەسێك ڕێبوار بترسێنێت و نەيكوژێت ئەوە تەنها شار بەدەر دەكرێت، ئەمە مەزهەبی ئيمامی شافعييە( ڕەزای خوای لیّ بێت ).

ئيمامی شافعی دەڵێت: هەركەسێك لەوانە بە پێی تاوانەكەی سزا دەدرێت، ئەوەی واجب بوو كە بكوژرێت و هەڵبواسرێت، پێش هەڵواسينی دەكوژرێت نەوەك ئازاری پیّ بكات، وە ئەوەی پێويست بوو تەنها بكوژرێت بەبیّ هەڵواسين، دەكوژرێت و دەدرێتەوە بە خاوەنەكەی بۆ ئەوەی بينێژن، وەئەوەی پێويست بوو تەنها دەستی ببڕدرێت، ئەوە دەستی ڕاستی دەبڕێت و يەكلا دەكرێتەوە،ئەگەر دووبارە گەڕايەوە و دزی كرد، ئەوە قاچی چەپی دەبڕێت، ئەمە (أبو بكر )و (عمر) كردويانە هاوەڵان هيچ تێبينيەكيان لەسەری نەبووە، ئەمەش مانای ئەو دەقەيە ﴿ مِّنْ خِلَـٰفٍ ﴾. وەهەروەها ﴿ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، (ابن عباس) دەڵێت: ئيمام ئەگەر نەيتوانی دەستگيری بكات دەڵێت: ئەوەی دەستی پیّ گەيشت بيكوژێت، بەڵام ئەگەر دەسەڵاتی هەبوو بەسەريدا ئەوە زيندانی دەكات، چونكە ئەگەر زيندانی بكرێت ئەوە دووركەوتۆتەوە لە خەڵك و شار،

(ابن قتيبة) دەربارەی زيندانييان دەڵێت:

| | |
|---|---|
| خرجنا من الدنيا ونحن من أهلها | فلسنا من الأحياء فيهـا ولا الموتى |
| إذا جـــاءنا السجان يوم لحاجة | عجبنا وقلنا جـــاء هذا من الدنيا |

دەڵێت: هەر بە بڕینی ڕێگاو ترساندنی ڕێبوار تاوانی گەورەی ئەنجامداوە، چ جا ئەگەر ماڵ ببا یا بریندار بکات، یا بکوژێت؟ ئەوە بێگومان چەند تاوانێکی گەورەی ئەنجامداوە لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە مرۆڤانە نوێژ ناکەن و ئەوەی بەدەستی دێنن بەو ڕیگە خراپە لە مەی و زیناو نێربازی و شتە خراپەکانی تردا بەکاری دەهێنن .

# تـاوانی بیست و پێنج

## سوێندی بەدرۆ

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا أُوْلَـٰٓئِكَ لَا خَلَـٰقَ لَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾( آل عمران: ٧٧). واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە پەیمانی خواو سوێندەکانیان بە نرخێکی کەم دەفرۆشن ( لە پلەو پایەی دونیایی، پارەو سامان، ئەڵبەتە هەرچەندە بێت هەر کەمە ) ئەوانە لە دوارۆژدا هیچ بەشێکیان نابێت ( لە سۆزو میهرەبانی خوا )، هەروەها لە ڕۆژی قیامەتدا خوا نایاندوێنێت و تەماشایان ناکات ( لە چڵك وپیسی گوناە ) خاوێنیان ناکات و سزای پڕ ئێش و ئازاریش بۆیان ئامادەیە .

(الواحدي) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەهۆی دووکەسەوە دابەزی کە سکاڵایان هێنا بۆ لای پێغەمبەرﷺ دەربارەی ونبوویەك، دەبوو تاوانبار سوێندی بخواردایەت، بەڵام ئەم ئایەتە دابەزی تا ببێت بە سزایەك بۆ تاوان بارکراو لە سوێندەکەی، وەدانی بەوەدا کە ماف داواکارە.

لە (عبد الله )وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:( من حَلَفَ على يَمِينٍ وَهو فيها فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بها مَالَ امرِيءٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللّهَ وهو عليه غَضْبَانُ ). واتە: هەرکەس سوێندێك بخوات بە درۆ بۆ ئەوەی ماڵی موسڵمانێك بە ناحەق داگیر بکات، ئەوە کاتێ دەگاتە بارەگای خوا زۆر لێی پەست و تووڕەیە ). (الأشعث) وتی: سوێند بەخوا ئەوە لەبارەی منەوە بوو، لە نێوانی من و جولەکەیەکدا پارچە زەویەك هەبوو ئەو نکوڵی لەوەکرد کە هی من بێت. منیش بردم بۆلای پێغەمبەر ﷺ.پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (شایەتت هەیە ) وتم: نەخێر، پێغەمبەر ﷺ بە جوولەکەکەی فەرموو(سوێند بخۆ ) منیش وتم: ئەی

پێغەمبەری خوا ئەو(گوێی لێ نیە ) سوێند ئەخواو ماڵەكەم ئەبات. خوایش لەو ڕووەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾ (٢) تا كۆتایی ئایەتەكە.

لە(عبد الله )ی كوڕی ( مسعود )وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (من حَلَفَ على يَمِينٍ وَهو فيها فَاجِرٌ لِيَقْتَطِعَ بها مَالَ امرىءٍ مُسْلِمٍ لَقِيَ اللَّهَ وهو عليه غَضْبَانُ ). (عبد الله) دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خوا ئەم دەقەی خوێندەوە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَأَيْمَـٰنِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾.

لە(أبو ذر)وە هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( قال ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ الله يوم الْقِيَامَةِ ولا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ ولا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمُسْبِلُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ). واتە: سێ كەس خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵدا دەكات و نە پاكیان دەكاتەوە و لە ڕۆژی دواییدا سزایەكی بە ئێشیان بۆ دەبێت: ئەوكەسەی كە دەرقاچەكەی درێژە، وە ئەوكەسەی كە منەت دەكات بەسەر خەڵكیدا،وە ئەو كەسەی كەلوپەلی دەفرۆشێت بە سوێندی درۆ ).

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : (الْكَبَائِرُ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ، وَالْيَمِينُ الْغَمُوسُ. واتە: تاوانە گەورەكان: هاوەڵ بۆخوا بڕیاردان، دڵ ئێشانی دایك و باوك، كوشتنی كەسێك، سوێندی درۆ . لەبەر ئەوە ناونراوە بە (الْغَمُوس) چونكە خاوەنەكەی دەخاتە ئاگرەوە .

الغموس: ئەو سوێندەیە كە بە درۆ دەخورێت،وە لەبەر ئەوە ناو نراوە بە (الغموس)، چونكە سوێندخۆرەكە ڕۆ دەچێت لە گوناه كردندا، وە وتراوە: ڕۆ دەچێت لە ئاگردا.

# بـــەش

لەو سوێند خواردنانە بە غەیری خوای گەورە، وەك: سوێند خواردن بە پێغەمبەر یا کەعبە، یا فریشتە یا ئاسمان یا ئاو یا ژیان یا ڕاسپاردە لەمانەش خراپتر: سوێند خواردن بە گیان، یا سەر، یا دەسەلاتدار یا خۆڵی فلان شوێن.

لە(ابن عمر)وە لە پێغەمبەری خواوە فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كان حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ وَإِلَّا فَلْيَصْمُتْ). واتە: خودای گەورە قەدەغەی کردووە لێتان سوێند بە باو وباپیرانتان بخۆن، جا هەرکەس سوێند دەخوات با سوێند بەخوا بخوات یا بێدەنگ بێت.

وە لە ( عبدالرحمن)ی کوڕی ( سمرة) – ڕەزای خوای لێ بێت – فەرمووی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَا تَحْلِفُوا بِالطَّوَاغِي ولا بِآبَائِكُمْ). واتە: هەرگیز سوێند بە بتەکان و باو وباپیرانتان مەخۆن .

(الطاغوت): بریتیە لە بتەکان.

پێغەمبەری نازدار ﷺ فەرموویەتی: (من حَلَفَ مِنْكُمْ فقال في حَلِفه: بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى فَلْيَقُلْ: لَا إِلَهَ إلا الله ). واتە: هەرکەس لە ئێوە سوێندی خوارد لە سوێندەکەیدا(وتی): سوێند بە ( اللات والعزى) ئەوە با بڵێت: لا إله الا الله.

هەندێ جار لە ناو هاوەڵاندا سوێند بە غەیری خوا دووبارە دەبووەوە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە پێش ئیسلامدا دەقیان لەسەر گرتبوو، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کرد کە هەرکەسێك سوێند بە غەیری خوا هات بەسەر زمانیدا با بڵێت: لا إله إلا الله. تا ببێت بە کەفارەتی ئەو گوناهە.

# تاوانی بیست و شەش

## ستەم کردن

خوای گەورە دەفەرمویت: ﴿ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوْمَ يَأْتِيهِمُ ٱلْعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رَبَّنَآ أَخِّرْنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ نُّجِبْ دَعْوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَ ۗ أَوَلَمْ تَكُونُوٓا۟ أَقْسَمْتُم مِّن قَبْلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٍ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمْ فِى مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴾( إبراهيم : ٤٢ -٤٥) . واتە: پەروەردگارا، خۆم و نەوەکانم بگێڕە لەو کەسانەی کە ئەنجامدەری نوێژ بین بە چاکی، پەروەردگارا، دوعاو نزام گیرا بکە. ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئیماندار) وا گومان مەبە کە خوا بێ ئاگایە لەو کارو کردەوەیەی ستەمکاران دەیکەن، بەڕاستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکانیان تیایدا ئەبڵەق دەبن. بە پەلەو شپرزەییەوە دێن، سەریان بەرز کردۆتەوە و لە ترس و سامناکی ئەو ڕۆژەدا چاویان ناترووکێت، دڵە ڕاوکێیانەو دڵ و دەروونیان بەتاڵە و هیچ حاڵی نین. ئەی (محمد) ﷺ خەڵك بترسێنە و بێداریان بکەرەوە لەو ڕۆژەی کە سزاو ئازار یەخەیان پێ دەگرێت، جا ئەوانەی کە ستەمیان کردووە دەڵێن: پەروەدگارا بۆ ماوەیەکی کەم و نزیك مۆڵەتمان بدە (بمانگێڕەوە بۆ دونیا) تا بەدەم بانگەوازەکەتەوە بچین و شوێنی پێغەمبەران بکەوین(بەڵام تازە کار لەکار ترازاوە گەڕانەوە ئەستەمە بۆیە پێیان دەوترێت)، مەگەر کاتی خۆی سوێندتان نەدەخوارد کە دونیا بەردەوامەو ئێوە تیاچوونتان نابێت ؟! ئێوە کاتی خۆیشی نیشتەجێ بوون لە ماڵ و حاڵ و شوێنی ئەواندا کە ستەمیان لە خۆیان کردو ( ڕێگەی ئیمان و خواناسیان نەگرت )

بۆتان دەرکەوت کە چیمان بەسەرهێنان و نموونە و باسی زۆرمان بۆ هێناوەنەتەوە ( دەربارەی سەرئەنجامیان ).

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظۡلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ ( الشورى : ٤٢) واتە: بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە .

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴾( الشعراء: ٢٢٧ ) .

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: ( إنَّ اللّهَ لَيُمْلِي لِلظَّالِمِ حتى إذا أخَذَهُ لم يُفْلِتْهُ)([1]) واتە: خوای گەورە ماوەی ستەمکار دەدات تاکو ئەو کاتەی دەیگرێت، ئیتر بەری نادات). پاشان ئەم دەقەی خوێندەوە:﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ ﴾ ( هود: ١٠٢ ). واتە: ئا بەو شێوەیە پەروەردگارت هەرکاتێك بیەوێت شار و دێهاتەکان گەر ستەمکار بن سزایان دەدات، سزای ئەو سزایەکی پڕ ئازارو سەختە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:( من كانت له مَظْلَمَةٌ لأخِيهِ من عِرْضِهِ أو شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ منه الْيَوْمَ قبل أنْ لَا يَكُونَ دِينَارٌ ولا دِرْهَمٌ إن كان له عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ منه بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ وَإِنْ لم تَكُنْ له حَسَنَاتٌ أُخِذَ من سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ ). واتە: هەرکەس ستەم و ناحەقییەکی بەرامبەر کەسێ کردووە چ دەربارەی شەرەف و ئابرووی بێ یا هەر شتێکی دیکە، با ئەمڕۆ گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات و پێش ئەوەی ڕۆژێك بێتە پێشەوە کە دینارو درهەم نەبێت، ئەگەر کردەوەیەکی چاکیشی هەبێت بە ئەندازەی ئەو ناحەقییەی کە ئەو کەسە کردوویەتی لێی دەسەنرێت و ( دەدرێت بە ستەملێکراوەکە خۆ ئەگەر

---

[1] – البخاري(٤٦٨٦)،ومسلم(٢٥٨٣).

چاكەیشی نەبوو لە خراپەو گوناهی ئەو كەسەی كە ستەمی لیٚ كردووە وەردەگیریٚت و دەدریٚت بەسەریدا .

هەروەها پیٚغەمبەرﷺ لە خوای گەورەوە فەرموویەتی: ( يا عِبَادِي إني حَرَّمْتُ الظُّلْمَ على نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فلا تَظَالَمُوا ). واتە: ئەی بەندەكانم، من ستەمم لەسەر خۆم قەدەغەكردووە و لە نیٚوان بەندەكانیشمدا قەدەغەم كردووە، كەواتە ستەم مەكەن .

پیٚغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (أَتَدْرُونَ ما الْمُفْلِسُ) واتە:(ئایە دەزانن موفلیس كیٚیە) وتیان: موفلیس لە لای ئیٚمە ئەو كەسەیە كە نە درهەمی هەیە و نە كەلوپەل،پیٚغەمبەر فەرمووی: ( إِنَّ الْمُفْلِسَ من أُمَّتِي يَأْتِي يوم الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَزَكَاةٍ وَصِيَامٍ وَيَأْتِي قد شَتَمَ هذا وَقَذَفَ هذا، وَأَكَلَ مَالَ هذا وَسَفَكَ دَمَ هذا، وَضَرَبَ هذا، فَيُعْطَى هذا من حَسَنَاتِهِ وَهَذَا من حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قبل أَنْ يُقْضَى ما عليه أُخِذَ من خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عليه ثُمَّ طُرِحَ في النَّارِ ). واتە: موفلیس لە ئوممەتەكەم ئەو كەسەیە كە لە رۆژی دواییدا دیٚت بە نویٚژو زەكات و رۆژووەوە، دیٚت جنیٚوی بەوە داوە،ئەوەی تومەتبار كردووە، ماڵی ئەوەی بردووە، خویٚنی ئەوەی رشتووە، لەوكەسەی داوە، جا ئەمەیان لە چاكەكەی وەردەگیریٚت و، ئەویتریان لە چاكەكەی وەردەگیریٚت، ئەگەر چاكەی نەما پیٚش ئەوەی دادوەری بكریٚت، تاوانەكانی ئەوان دەدریٚت بە كۆڵیدا، پاشان فریٚ دەدریٚتە ناو ئاگرەوە.

وە لە صەحیحدا هاتووە: ( من أَخَذَ من الأرض شيئا بِغَيْرِ حَقِّهِ خُسِفَ بِهِ يوم الْقِيَامَةِ إلى سَبْعِ أَرَضِينَ ) واتە:هەر كەس زەوی كەسیٚك داگیربكات ،لە رۆژی دواییدا تیایدا رۆدەچیٚت تا حەوت چینی زەوی .

هەندێ لە شاعیرەکان دەربارەی دەڵێن:

| | |
|---|---|
| لا تظلمن إذا مـا كنت مقتـدرا | فالظلم يرجع عقباه إلى النـدم |
| تنام عيناك والمـظلوم منتبـه | يدعو عليك وعين الله لـــم تنم |
| أمـــــا والله إن الظلم شـؤم | ومــا زال المسئ هـــو الظلوم |
| ســـتعلم يا ظلوم إذا التقينا | غـــدا عند المليك من الملوم |
| توق دعا من ليس بين دعـائه | وبين إله العـــالمين حجــاب |
| ولا تحسبن الله مطرحـــا لـه | ولا أنه يخفى عليه خطـــاب |
| فقد صـــح أن الله قال وعزتي | لأنصــرن المظلوم وهو مثاب |
| فمن لم يصدق ذا الحديث فإنه | جهـول و إلا عقله فمصـــاب |

## بــەش

لە گەورەترین ستەم دواخستنی ماڧ کرێکارە لە لایەن کەسێکی دەوڵەمەندەوە، وەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ ). واتە: دواخستنس دەوڵەمەند بۆ دانەوەی قەرز ستەمە.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە:( لَيُّ الْوَاجِدِ ظُلْمٌ يُحِلُّ عِرْضَهُ وعُقُوبَتَهُ )[٢]. واتە: دواخستنی دەوڵەمەند بۆ دانەوەی قەرز ستەمە، دروستە سکاڵای لێ بکرێت و سزا بدرێت و زیندانی بکرێت.

٢ – أبو داود(٣٦٢٨)، وابن ماجه(٢٤٢٧) وصححه الشيخ الألباني.

## بەشێكی تر

یەكێكی تر لە ستەم كردن ئەوەیە كە ئافرەت مافی پێشێل بكرێت لە مارەیی و خەرجی ژیان ئەویش لە چوارچێوەی ئەم فەرمودەدایە(لَيُّ الْوَاجِدِ ظُلْمٌ يُحِلُّ عِرْضَهُ وعُقُوبَتَهُ ). واتە: دواخستنی دەوڵەمەند بۆ دانەوەی قەرز ستەمە، دروستە سكاڵای لێ بكرێت و سزا بدرێت و زیندانی بكرێت.

## بەشێكی تر

یەكێكی تر لە ستەم ئەوەیە كەسێك كەسێكی تر بە كرێ بگرێت دوایی مافەكەی پێنەدات،لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : خوای گەورە دەفەرموێت:(ثَلَاثَةٌ أنا خَصْمُهُمْ يوم الْقِيَامَةِ: رَجُلٌ أَعْطَى بِي ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى منه ولم يُعْطِ أَجْرَهُ )[1].واتە: سێ جۆر كەس هەن كە خۆم سكاڵاكارم لەسەریان لە ڕۆژی قیامەتدا: كەسێك كە پەنای كەسێك بدات لەبەر من پاشان خیانەت و ستەمی لێ بكات، بەڵێنی ئەمان بدات و نەیباتە سەر، هەروەها كەسێك كەسێكی ئازاد بكاتە بەندەی خۆی و بیفرۆشێت و نرخەكەشی بخوات، هەروەها كەسێك یەكێك بەكرێ بگرێت و ئیشەكەی خۆی پێ بكات و دوایی كرێكەی نەداتێ.

یەكێكی تر لەو تاوانە گەورانە ئەوەیە كە كەسێك قەرزی لە لا بێت و سوێند بە درۆ بخوات،پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ الله له النَّارَ وَحَرَّمَ عليه الْجَنَّةَ، قيل: يا رَسُولُ الله وَإِنْ كان شيئا يَسِيرًا ؟ قال: وَإِنْ قَضِيبًا من أَرَاكٍ )[1]. واتە: هەركەس بە سوێندی درۆ مافی موسڵمانێك بۆ خۆی ببڕێت، ئەوە بێگومان ئاگری دۆزەخی بۆ خۆی واجب كردووەو، بەهەشتی لێ قەدەغەیە، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا

---

[1] – البخاري(٢٢٢٧).

[1] – مسلم(١٣٧).

ئەگەر شتێکی کەمیش بێت؟ فەرمووی: ئەگەر دارێکی ( أراك) یش بێت. ( أراك) ئەو دارەیە کە بۆ سیواك بەکار دێت.

فخف القصاص غدا إذا وفيت ما كسبت يداك اليوم بالقسطاس
في موقف ما فيه إلا شـــاخص أو مهطـع أو مقنع للـــــراس
أعضاؤهم فيه الشهود وسجنهم نار وحاكمهم شديد البـــاس
إن تمطل اليوم الحقوق مع الغنى فغـــدا تؤديها مـــع الإفلاس

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إلى أهْلِهَا يوم الْقِيَامَةِ حتى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ من الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ )[١]. واتە: دەبێت لە ڕۆژی دواییدا مافەکان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەکانیان، هەتا تۆڵەی بەرانی بێ شاخ لە شاخدار دەکرێتەوە.

(شريح القاضي) دەڵێت: لە داهاتوودا ستەمکاران دەزانن مافی ئەو کەسانەی کە بە ناحەق خواردوویانە، چونکە ستەمکار چاوەڕوانی سزا دەکات و ستەملێکراویش چاوەڕوانی تۆڵەو سەرکەوتنە.

## بەشێکی تر

لە ئاگەداربوون لە چوونە ناو ستەمکاران و تێکەڵی و پشتگیری کردنیان

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ ﴾( هود : ١١٣). واتە: نەکەن مەیلی دڵتان لەگەڵ ئەوانەدا بێت کە ستەمیان کردووە و لە خوا یاخی بوون، چونکە ئەو کاتە ئاگر دەتانسووتێنێت .

( الركون) واتە: مەیل بۆ شتێك و حەزو ئارەزوو خۆشەویستی بۆی.

---

١ـ

(ابن عباس) دەڵێت: هەرگیز ئارەزوو خۆشەویستی و نەرم و نیانی بۆ ستەمکار دەرمەبڕن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴾( الصافات : ٢٢ ). واتە: خوای گەورە فەرماندەدا بە فریشتەکان بە هەموو ئەوانەی ستەمیان کردووە کۆیان بکەنەوە، خۆیان و هاوسەرانیان، خۆیان و هاوشێوەیان و ئەو شتانەش کە دەیانپەرست .

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أو مَظْلُومًا) فقال: يا رَسُولَ اللَّهِ، أَنْصُرُهُ إذا كان مَظْلُومًا، فَكَيْفَ أَنْصُرُهُ إذا كان ظالِمٌ ؟ قال: ( تَمْنَعُهُ من الظُّلْمِ فإن ذلك نَصْرُهُ )[1]. واتە: براکەت سەر بخە ئەگەر ستەمکار بوو یا ستەملێکراو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سەری دەخەم ئەگەر ستەملێکراو بوو، ئەی چۆن سەری بخەم ئەگەر ستەمکار بوو؟ فەرمووی: ڕێگری لێ دەکەی تا ستەم ناکات، ئەوە سەرخستنێتی.

## ئامۆژگاری

مردن چەندین گیانی کێشا بەبێ ویستی خاوەنەکەی؟! کوا ئەوکەسەی کە دەسەلاتی ڕۆژئاوا ڕۆژهەڵاتی بەدەست بوو؟!، خاوەن باخ و باخات و خزمەتکارو دونیا بوو، ئەی کوا ئاواتەکانی؟! داخۆ ئێستە چەند جار قەلەڕەش لە ماڵەکەیدا بە چۆڵەوانی خوێنایەتی؟! ئەی کوا هاوڕێ دڵسۆزەکان؟! هەموویانی بەجێهێشت بۆ خزمەتی خالقی ڕاستەقینە چوو.

جێگەی نەرم و نیانی گۆڕیەوە بە زبری خۆڵ، کرم جستەی لەت و پەت کرد وەك چۆن قوماش لەت دەکرێت، مایەوە لە تاریکیەکی تەنگ و ناخۆشدا پاش ژیانی خۆش، دورکەوتەوە لە دۆست و هاوڕێ یەکان وەك ئەوەی هەرگیز نەژیابێ.

[1] – البخاري( ٢٤٤٣)، ومسلم(٢٥٨٤).

# تاوانی بیست و حەوت

# گومرك یا باج وەرگرتن

خوای گەورە دەفەرمویت :﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾( الشورى : ٤٢) . واتە: بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە .

باج وەرگر: لە گەورەترین هاوکارەکانی ستەمکارانە، بەڵکو ئەو خۆی یەکێکە لەو ستەمکارانە، چونکە ئەوەی وەری دەگرێت حەقی خۆی نیە ودەیدات بە کەسانێك کە شایستە نین.

باج وەرگر لە ڕۆژی دواییدا چۆن مافی ئەو خەڵکە دەگێڕێتەوە کە لێی وەرگرتوون، بەڕاستی خەڵکی لەو ڕۆژەدا چاکەکانی دەبەن ئەگەر خاوەن چاکە بێت! ئەگەر نا ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ ڕاستەوخۆ دەیگرێتەوە:(أَتَدْرُونَ ما الْمُفْلسُ) واتە:(ئایە دەزانن موفلیس کێیە ) وتیان: موفلیس لە لای ئێمە ئەو کەسەیە کە نە درهەمی هەیە و نە کەلوپەل، فەرمووی: ( إِنَّ الْمُفْلِسَ من أُمَّتِي يَأْتِي يوم الْقِيَامَةِ بِصَلَاةٍ وَزَكَاةٍ وَصِيَامٍ وَيَأْتِي قد شَتَمَ هذا وَقَذَفَ هذا، وَأَكَلَ مَالَ هذا وَسَفَكَ دَمَ هذا، وَضَرَبَ هذا، فَيُعْطَى هذا من حَسَنَاتِه وَهَذَا من حَسَنَاتِه، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قبل أَنْ يُقْضَى ما عليه أُخِذَ من خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عليه ثُمَّ طُرِحَ في النَّارِ ). واتە: موفلیس لە ئوممەتەکەم ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دێت بە نوێژو زەکات و ڕۆژوو، دێت جنێوی بەوە داوە،ئەوەی تومەتبار کردووە، ماڵی ئەوەی بردووە، خوێنی ئەوەی ڕشتووە، لەوکەسەی داوە، جا ئەمەیان لە چاکەکەی وەردەگرێت، ئەویتریان لە چاکەکەی وەردەگرێت، ئەگەر چاکەی نەما پێش ئەوەی

دادوەری بكرێت، تاوانەكانی ئەوان دەدرێت بە كۆڵیدا، پاشان فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ لَحْمٌ نَبَتَ من سُحْتٍ، النَّارُ أوْلَى بِهِ)[٢]. واتە: ناچێتە بەهەشتەوە گۆشتێك كە بە حەرام گەشەی كردبێت، ئاگر دەبێ بیسوتێنی.

(السحت) بریتیە: لە هەموو ماڵێكی حەرام و پیس و قیزەون خاوەنەكەی پێی شەرمەزار دەبێ ئەگەر باسی بكات .

## ئامۆژگاری

كوا ئەو كەسانەی كە خاوەن قەڵای بەرزو بەهێز بوون، باخچەیان ئاوەدان كردبوەوە بە گوڵ و گوڵزار، تەختی بەرزیان دروست كردبوو لەسەری دادەنیشتن، گەیشتبوونە ئەوپەڕی خۆشی و لەزەتی دونیا، بەڵام مردن هەموو لەزەتەكانی لەبیر بردنەوە، ڕووی پێ كردە داهاتووی بەلا و چرای دونیای كوژاندەوە، لەتاریكیدا بەجێی هێشت، جا ئاقل ئەو كەسەیە كە ژیانی دونیای دەكاتە قوربانی دواڕۆژ .

٢ – الترمذي(٦١٤)، والحاكم في المستدرك ٤ \ ٤٢٢ وقال: حديث صحيح الإسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي.

## تاوانی بیست و هەشت

## خواردنی ماڵی حەرام یان بەكارهێنانی بەهەرجۆرێ بێت

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ ( البقرة: ١٨٨ ).واتە: نەكەن ماڵ و دارایی یەكتر لە نێوانتاندا بە ناحەق بخۆن ( وەكو بەرتیل و سوو، یان داگیركردن وفرتوفێڵ.... ) .

هەندێكیان ماڵی یەكتر دەخۆن بە ناڕەوا، ئەمەش دەبێت بە دوو بەشەوە:

یەكەم: لەو ڕووەی كە بە زۆر دەیخوات وەك توڕەیی و خیانەت و دزی .

دووەم: لە ڕووی قومار كردن و كات بەسەربردن و هاوشێوەی ئەوانە .

لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إِنَّ رِجَالًا يَتَخَوَّضُونَ فِي مَالِ اللَّهِ بِغَيْرِ حَقٍّ فَلَهُمْ النَّارُ يوم الْقِيَامَةِ). واتە: ئەوانەی بەشێوەیەكی نا تەندروست هەڵسوكەوت بە ماڵی خەڵكەوە دەكەن ئەوە بەشی ئەوان ئاگرە لە ڕۆژی دواییدا .

وە لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( إِنَّ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْهِ إلى السَّمَاءِ، يَقُولُ: يا رَبِّ، وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ ). واتە: بەڕاستی پیاوێك گەشت دەكاو ڕێگا دەبڕی( بۆ حەجكردن و بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی ) سەروچاوی تۆزاوییە دەستی بەرز دەكاتەوە بۆ ئاسمان، دەڵێت: ئەی پەروەردگار،خواردن و خواردنەوەی حەرامە، پۆشاكی حەرامە، بەحەرامیش گۆش كراوە، ئەی چۆن دوعاو نزای گیرا دەبێ).

(ابن عباس) دەڵێت: خوای گەورە نوێژی كەسێك قبووڵ ناكات لە هەناویدا حەرام هەبێت، هەتا تەوبەی لێ دەكات و دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای گەورە .

(سفيان الثوري): دەڵێت: هەركەسێك بە ماڵی حەرام ببەخشێت، وەك ئەوە وایە جلەكەی بە میز پاك بكاتەوە، بێگومان جل و بەرگ تەنها بە ئاو پاك دەبێتەوە، تاوانیش بە هیچ پاك نابێتەوە جگە لە حەلاڵ نەبێ.

ئیمامی( عمر)دەڵێت: ئێمە لە (نۆ) لە (دە) ی شتە حەلاڵەكان دوور دەكەوتینەوە لە ترسی ئەوەی نەكەوینە ناو حەرامەوە.

(زید) ی كوڕی (أرقم) دەڵێت: ئەبوبكر خزمەتكارێكی هەبوو خستبوویە سەر پارە و سامان، هەموو ڕۆژێك شتی بۆ دەهێنا، دەیفەرموو ئەمە لەكوێ هێناوتە؟ ئەگەر ڕازی بكردایە دەیخوارد ئەگەر نا وازی لێ دەهێنا.

وتی: شەوێك خواردنی هێنا بۆ ئەبو بكر كە بەڕۆژوو بوو، ئینجا تیكەیەكی لێی خوارد بەڵام بیری چوو پرسیاری لێ بكات، پاشان پێی فەرموو: ئەمەت لە كوێ هێناوە؟ وتی: من لە كاتی نەفامیدا فاڵم بۆ خەڵك دەگرتەوە و باشم لێ نەدەزانی، بۆ یە هەڵیانم دەخەڵەتاند، ئەبو بكر فەرمووی:ئاخ لە تۆ خەریكە لە ناوم دەبەیت! پاشان دەستی كرد بە قوڕگی خۆیدا بۆ ئەوەی خۆی بڕشێنێتەوە نەدەڕشایەوە، پێی وترا: دەرناچێت ئیللا بە ئاو نەبێ، پاشان ئاویان بۆ هێنا خواردیەوەو خۆی دەڕشاندەوە هەتا ڕشایەوە هەمووی لەسكی دەركرد.

پێی وترا: -ڕەحمەتی خوات لێ بێت- هەموو ئەمە لەبەر یەك تیكەی حەرام؟ فەرمووی: ئەگەر بە گیان دەرچوونم بوایە، گیانم لەگەڵیدا دەردەكرد، گوێم لە پێغەمبەرﷺ بوو دەیفەرموو:( كُلُّ جَسَدٍ نَبَتَ من سُحْتٍ، النَّارُ أَوْلَى بِهِ )[1]. واتە: هەموو جەستەیەك بە حەرام گەشەی كردبێت، ئاگر دەبێ بیسوتێنی.

زانایان -ڕەحمەتی خوایان لێ بێت- دەڵێن: ئەم باسە هەموو ئەمانە دەگرێتەوە: ئەوەی گومرك وەردەگرێت، ئەوەی دزی دەكات، ئەوەی ناپاكی دەكات ، ئەو كەسەی كە

---

[1] – البخاري(٣٨٤٢).

ڕیبا وەردەگرێت ، ئەوەی دەبێت بە وەکیلی، ئەوەی ڕەشوە (بەرتیل) وەردەگرێت، ئەوەی لە تەرازو و کێشانەدا فێڵ دەکات ، ئەوەی شتێ دەفرۆشێت و عەیبێکی تێدا بێت و باسی ناکات، ئەوەی قومار دەکات، ئەوە سیحر و فاڵ دەگرێتەوە، ئەوەی وێنە دەکێشێت، ئەوەی زینا دەکات ، ئەوەی بەسەر مردوودا شیوەن دەکات، ئەوەی دەلاڵی دەکات ئەگەر حەقی خۆی لێ دەربکات بەبێ ڕوخسەتی فرۆشیارەکە، وەئەوەی کڕیار دەدۆزێتەوەو دەیخەڵەتێنێت.

## ئامۆژگاری

بەندەکانی خوا، ڕۆژگارو شەوەکان ئەجەل نزیك دەکەنەوە،ژیانی دونیا هەتا هەتایی نیە، هەموو لەشساغێك نەخۆش دەکەوێت، بەڵام دوای جێگیربوونی، ئەجەل هێرش دەهێنێت، بێگومان ئەوپەڕی لەش ساغی ناتەواوی کامڵ بوون دەردەخات، ئایە سوودتان وەرگرت لەو هەموو پەندەی کە لە ڕۆژگاری تەمەن دەیبینن.

# تاوانی بیست و نۆ

# کەسێك خۆی بکوژێت

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾( النساء : ٢٩، ٣٠).

واتە: خۆتان مەکوژن و یەکتر بە ناحەق مەکوژن، کاتێك بێزاریی و بێتاقەتی ڕووتان تێدەکات یان تووشی زیانێك دەبن، بەڕاستی خوا میهرەبانە. هەرکەسێکیش کاری وابکات (سامانی خەڵکی بە ناحەق بخوات یان خۆی یان خەڵك بکوژێت) بە دوژمنایەتی و ستەمکردن، ئەوە لە ئایندەدا دەیخەینە دۆزەخەوە و بە ئاگر دەیسوتێنین، ئەو کارەش بۆ خوا هەمیشە و بەردەوام ئاسانە .

( الواحدي) دەڵێت: لە تەفسیری ئەم دەقەدا:﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ﴾ واتە: با یەکتری نەکوژن چونکە هەمووتان پەیڕەوی یەك ئایین دەکەن، ئێوە وەك یەك گیان وان، ئەمە وتەی ( ابن عباس ) و زۆربەی زانایانە.

هەندێکی تر لە زانایان دەڵێن ئەم ئایەتە خۆ کوشتن قەدەغە دەکات.

بەڵگە لەسەر ڕاستی ئەمە ئەوەیە لە (عمرو ) کوری ( العاص )وە دەڵێت: لە جەنگی ( ذات السلاسل )دا لە شەوێکی زۆر سارددا جەنابەت بووم، ترسام کە خۆم بشۆم لەناو بچم، پاشان تەیەمومم کرد و نوێژی بەیانیم بۆ هاوەڵانم کرد، ئەوەیان بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: ( یا عمرو صلیت بأصحابك و أنت جنب ) واتە: ئەی عەمر پێش نوێژیت بۆ بە هاوەڵەکانت کردو جەنابەت بوویت؟! منیش پێم وت کە چی بەربەستی کردم لە خۆشۆردن، وتم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَٰنًا وَظُلْمًا فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا ۚ

وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾(النساء: ٣٠) واته: خۆتان مەكوژن ، خودا بەبەزەییە ، پێغەمبەرﷺ پێكەنی و هیچی نە فەرموو.

كەواتە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی كە (عمرو ) كوری ( العاص ) بە مانای لەناو بردنی گیانی خۆی تەفسیری كردووە نەك كەسێكی تر، پێغەمبەرﷺ ئەم لێكدانەوەی پێ ناخۆش نەبوو.

(ابن عباس) دەربارەی مانای ئەم دەقە ﴿ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ﴾ دەڵێت: وشەی ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئاماژەیەكە دەگەڕێتەوە بۆ هەموو قەدەغە كراوێك لەسەرەتای سورەتەكەوە تا ئەم شوێنە.

كۆمەڵێكی تر دەڵێن: ئەم هەڕەشەیە دەگەڕێتەوە بۆ خواردنی ماڵ بە ساختەو خۆڕایی و كوشتنی كەسێك بە ناحەق، وە ﴿ عُدۡوَٰنًا وَظُلۡمًا ﴾ واتە: دژایەتی شتێك بكات كە خوای گەورە فەرمانی پێ كردبێ، ﴿ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴾.واتە: خوای گەورە دەتوانێت پەیمانی خۆی جێبەجێ بكات لە خستنە دۆزەخەوە.

وە لە ( جندب ) كوڕی ( عبدالله ) دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (كان فِيمَنْ كان قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ فَأَخَذَ سِكِّينًا فَحَزَّ بها يَدَهُ فما رَقَأَ الدَّمُ حتى مَاتَ قال الله تَعَالَى بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِه حَرَّمْتُ عليه الْجَنَّةَ)[١].واتە: لە زەمانێكی پێش ئێوەدا كابرایەك برینێكی لێ پەیدا دەبێت، خۆی پێ ناگیرێ لە تاو ئازاردا، چەقۆیەك دەگرێت و دەماری دەستی خۆی پێ دەبڕێت ئیتر خوێنەكە ناوەستێتەوە هەتا دەمرێت. خوای گەورەش دەفەرموێت:ئەو بەندەیەم خۆی كوشت!! منیش بەهەشتی لێ حەرام دەكەم.

وە لە ( ابي هريرة ) وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : من تَرَدَّى من جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ يَتَرَدَّى فيه خَالِدًا مُخَلَّدًا فيها أَبَدًا وَمَنْ تَحَسَّى سُمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ

[١] — البخاري( ٣٤٦٢)، ومسلم(١١٣).

فَسُمُّهُ في يَدِهِ يَتَحَسَّاهُ في نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فيها أَبَدًا وَمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ في يَدِهِ يَجَأُ بها في بَطْنِهِ في نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فيها أَبَدًا)[٢]. واتە: كەسێك لە كێوێكەوە خۆی بەربداتەوە و خۆی بكوژێت، ئەوە لە ئاگری دۆزەخدا دەبێ و، تیایدا بە هەمیشە و بەردەوام بەردەبێتەوە. هەركەسێك ژەهرێك بنۆشێ و خۆی بكوژێت، لە ئاگری دۆزەخدا ژەهرەكە بە دەستیەوە دەبێ و هەمیشە و بەردەوام دەینۆشێ. هەركەسێكیش بە پارچە ئاسنێ خۆی بكوژێ، پارچە ئاسنەكە لە دۆزەخدا بە دەستیەوە دەبێ و هەمیشە و بەردەوام دەیكا بە سكی خۆیدا.

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە دەربارەی كەسێك كە برین زۆری پێ هێنا بە شمشێرەكەی خۆی كوشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (هو من أَهْلِ النَّارِ).واتە: ئەو لە ئەهلی دۆزەخە.

## ئامۆژگاری

ئەی ئەو كەسەی پشتت لە ئایین كردووە، تاكەی ئەم دڵڕەقیەو پشت تێكردنە! ئەی بێ ئاگا دەزانی گومانی تێدا نیە مردن و تەمەن بەرەو لە ناوچوون! دەڕوا ،ئەی ئەو كەسەی دەتەوێ لەخۆ بایی بیت لە مردن و سەرەمەرگ، ئەی نازانی لەش ساغی هەموو ڕۆژێكی تەمەن لە قرتێكەوتندایە! ئەی بێ ئاگا لە ئامادەكردنی توێشوو، خۆ ئاگەدار كراویتەتەوە لە مووی سپی دوای مووی ڕەش! سەرسوڕمانە بۆ هەر كەسێك ئەم هەموو كاتەی لەبەردەستدایە چۆن دەتوانێت چاوی لێ بخەوێنێت.

*****

---

[٢] – البخاري( ٥٧٧٨)، ومسلم(١٠٩).

## تـاوانی سی

## درۆکردن لە زۆربەی قسەکاندا

خوای گەورە دەفەرمویت :﴿ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰذِبِينَ ﴾( آل عمران :٦١) . واتە: پاشان لە خوا بپاڕێینەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا دابباریتە سەر درۆزنەکان .

خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ قُتِلَ ٱلْخَرَّٰصُونَ ﴾( الذاريات:١٠).واتە: دەك بکوژرێن درۆزن و بوختانچیەکان .

خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾( غافر : ٢٨ ) . واتە: خوا هیدایەت و ڕێنمویی کەسێك ناکات زیادەڕەو و درۆزن بێت ).

لە ( ابن مسعود ) وە دەڵێت : پێغەمبەر ی خوا ﷺ فەرموویەتی : (إِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إلى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إلى الْجَنَّةِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَصْدُقُ حتى يَكُونَ صِدِّيقًا، وَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إلى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إلى النَّارِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حتى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا)[١]. واتە: بەدڵنیاییەوە ڕاستگۆیی ڕێنوێنی مرۆڤ دەکات بۆ ئەوپەڕی چاکەکاری، چاکە کاریش ڕێنیشاندەرە بۆ بەهەشت، بەڕاستی مرۆڤی وامەیە هەر ڕاستگۆیی دەکات تا وای لیّ دێت لای خواوەند بە کەسێکی ڕاستگۆ تۆمار دەکرێت، هەروەها بە دڵنیایی درۆکردن ڕێنوێنی مرۆڤ دەکات بۆ لادان و ترازان و بەدکاری، لادانیش ڕینیشاندەرە بۆ ئاگری دۆزەخ،

[١] – البخاري( ٦٠٩٤)، ومسلم(٢٦٠٧).

بەڕاستی مرۆڤ هەر درۆ دەكات تا وای لیّ دیّت لای خواوەند بە كەسیّكی درۆزن تۆمار دەكریّت.

(أبو هريرة) دەلّیّت:پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إذا حَدَّثَ كَذَبَ وإذا وَعَدَ أَخْلَفَ وإذا أؤتمن خَانَ. واتە: نیشانەی دوو ڕوو سیّ شتە: ئەگەر قسەی كرد درۆ بكات، ئەگەر بەڵیّن و پەیمانیّكی دا نەیباتە سەر، ئەگەر ئەسپاردەی لەلا دانرا خیانەتی لیّ بكات .

(عبد الله)ی كوڕی (عمر) دەلّیّت:پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (أَرْبَعٌ من كُنَّ فيه كان مُنَافِقًا خَالِصًا وَمَنْ كانت فيه خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كانت فيه خَصْلَةٌ من النِّفَاقِ حتى يَدَعَهَا: إذا أؤتمن خَانَ، وإذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا عَاهَدَ غَدَرَ، وإذا خَاصَمَ فَجَرَ )[1]. واتە: چوار شت هەن هەركەس تیایدا بیّت دووڕوویەكی تەواوە، هەركەسیش یەك شت لەو چوارەی تیّدا بیّت ئەوە نیشانەیەكی دووڕوویی تیّدایە هەتا وازی لیّدەهیّنیّت: ئەگەر ئەمانەتیّكی لەلا دانرا خیانەتی تیّدا بكات، ئەگەر قسەی كرد درۆ بكات، ئەگەر پەیمانیّكی دا بەكەسیّك بیشكیّنیّت و نەیباتە سەر، ئەگەر ناكۆكیەیكی لەگەڵ كەسیّك هەبوو لە حەق و ڕاستی لا بدات .

وە لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە : (إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فإن الظَّنَّ أَكْذَبُ الحديث ). واتە: خۆتان بپاریّزن لە گومان چونكە بەڕاستی گومان درۆترین باس و قسەیە.

پیّغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ الله يوم الْقِيَامَةِ ولا يُزَكِّيهِمْ ولا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: شَيْخٌ زَانٍ، وَمَلِكٌ كَذَّابٌ، وَعَائِلٌ مُسْتَكْبِرٌ ). واتە: سیّ تاقم هەن خوا لە ڕۆژی دواییدا قسەیان لەگەڵ ناكات و پاكیان ناكاتەوە و بەچاوی(ڕەحمەت) تەماشایان

---

[1] – البخاري( ٣٤)، ومسلم(٥٨).

ناکات و سزای بەئێشیان بۆ هەیە: پیرێکی داوین پیس، دەسەلآتدارێکی درۆزن، هەژارێکی لوت بەرز.

لەوانە گەورەتر سوێند خواردنە بە درۆ، وەك چۆن خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی دووڕووەکان دەفەرموێت:﴿ وَيَحْلِفُونَ عَلَى ٱلْكَذِبِ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾( المجادلة: ١٤ ). واتە: سوێند لەسەر درۆ دەخۆن لە کاتێکدا کە خۆشیان دەزانن درۆیە..

وە لە فەرموودەی (صەحیحدا) هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ الله يوم الْقِيَامَةِ ولا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ: رَجُلٌ حَلَفَ على سِلْعَةٍ لقد أَعْطَى بها أَكْثَرَ مِمَّا أَعْطَى وهو كَاذِبٌ، وَرَجُلٌ حَلَفَ على يَمِينٍ كَاذِبَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ لِيَقْتَطِعَ بها مَالَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ، وَرَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ مَاءٍ فيقول الله: الْيَوْمَ أَمْنَعُكَ فَضْلِي كما مَنَعْتَ فَضْلَ ما لم تَعْمَلْ يَدَاكَ)[٢]. واتە: سێ کەس هەن خوا لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکات و بەچاوی (ڕەحمەت) تەماشایان ناکات: پیاوێك سوێند بخوات لەسەر کوتاڵ و شت و مەکێك کە گوایە زیاتری پێداوە لەو نرخەی کە کڕیار دەیداتێ بە درۆوە، پیاوێکیش پاش عەسر سوێندێکی درۆ بخوات بۆ ئەوەی ماڵی پیاوێکی موسڵمانی پێ داگیر بکات، پیاوێکیش ئاوێکی زیاد لە پێویستی خۆی هەبێت و لەخەڵکی بگرێتەوە. (لە ڕۆژی دواییدا) خوا پێی دەفەرموێ: منیش ئەمڕۆ خێرو بەخششی خۆمت لێ دەگرمەوە وەك چۆن تۆ ( لە دونیادا) ئەو زیادەیەت لە خەڵکی دەگرتەوە کە لە بنەڕەتدا خۆت بەدیت نەهێنابوو.

کەواتە پێویستە لەسەر موسڵمان زمانی خۆی بپارێزێت لە قسەکردن، ئیللا قسەیەك نەبێت کە قازانجێکی گشتی تێدا بێت، بەڕاستی لە بێدەنگیدا ئاسودەیی هەیە، وەهیچ شتێك هاوتای ئاسودەیی و ئاشتی نیە.

---

[٢] – البخاري( ٢٣٥٨)، ومسلم(١٠٨).

وه له (صەحیحی) بوخاری وموسلیمدا هاتووه له (ابو هريرة) – ڕەزای خوای لیٚ بێت – پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ كان يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أو لِيَصْمُتْ)[1]. واته: هەرکەس بڕوای بەخواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەیەکی خێر بکات یا بێدەنگ بێت.

ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نابێت موسڵمان قسە بکات ئیللا بۆ خێر و چاکە نەبیٚ، تەنها ئەوە قازانجی قسەکەری تێدایە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ من رِضْوَانِ الله ما كان يَظُنُّ ان تَبْلُغَ ما بَلَغَتْ يَكْتُبُ الله له بها رِضْوَانَهُ إلى يَوْمِ يَلْقَاهُ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ من سَخَطِ الله ما كان يَظُنُّ ان تَبْلُغَ ما بَلَغَتْ يَكْتُبُ الله له بها سَخَطَهُ إلى يَوْمِ يَلْقَاهُ)[1].واته: بەڕاستی کەسێك قسەیەك دەکات لە ڕەزامەندی خوای گەورە نازانێت ئەو قسەیە چەندە پلەی بەرز کردوەتەوە، خوای گەورە ڕەزامەندی خۆی بۆ دەردەبڕیٚ هەتا ئەو ڕۆژەی دەگاتە خزمەتی،بەدڵنیاییەوە کەسێك قسەیەك دەکات خوا لەخۆی توڕە دەکات نازانیٚ چەندە پێی دابەزیوە، خوای گەورە توڕەیی خۆی لەسەری دەنووسێت هەتا ئەو ڕۆژەی دەگاتە خزمەتی.

فەرموودە دەربارەی ئەم بابەتە زۆرە بەڵام تەنها ئەوەندە بەسە کە ئاماژەمان پێی کرد .

پرسیار لە دانایەك کرا: چەند کەموو کوڕیت لەنەوەکانی ئادەمدا بەدی کردووە؟ وتی: زۆرترە لەوەی لە ژماردن بێت، ئەوەی کە من ژماردوومە دەگاتە هەشت هەزار کەمو کوڕی، بەڵام یەك سیفەتم بینیوە ئەگەر پەیڕەو بکرێت هەموو عەیبەکان دەپۆشێت، ئەویش پاراستنی زمانە !.

---

[1] – البخاري( ٦٠١٨)، ومسلم(٤٧).

[1] – مالك في الموطأ ٢ \ ٩٨٥ .

# تاوانی سی و یەك

## دادوەری خراپ

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾( المائدة : ٤٤) . واتە: جا ئەوەی حوكم و دادوەری بەو بەرنامەیەوە نەكات كە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە بێ باوەڕن .

وە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾( المائدة : ٤٥ ) . واتە: بێگومان ئەوەی حوكم و دادوەری نەكات بەو بەرنامەیەی كە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە ستەمكارن.

وە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾( المائدة : ٤٧) .واتة: ئەوەی حوكم و دادوەری نەكات بەو بەرنامەیەی كە خوا دایبەزاندووە، ئا ئەوانە ناپاك و تاوانبار و لە سنوور دەرچوون .

وە لە ( ابو هريرة ) وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( من جُعِلَ قَاضِيًا بين الناس فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ). واتە: هەركەس بكرێت بە دادوەر لە ناو خەڵكدا ئەوە سەربڕاوە بەبێ چەقۆ.

(فضيل)ی كوڕی (عياض) – ڕەزای خوای لێ بێت - دەڵێت: پێویستە لەسەر دادوەر ڕۆژێك دابێت بۆ دادوەریی و ڕۆژێكی تر بۆ گریان بۆ خۆی.

(محمد)ی كوری (واسع) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێت: یەكەم كەس كە بانگ دەكرێت بۆ لێپرسینەوە، دادوەرەكانە.

(مكحول) – ڕەحمەتی خوای لێ بێت - دەڵێت: ئەگەر ئازادم بكەن لە نێوان دوو شتدا: بوونم بە دادوەر یا لێدان لە گەردنم ئەوە لێدان لە گردنم هەڵدەبژێرم لە بری دادوەریی! .

(مالك)ی کوری (المنذر) داوای له (محمد)ی کوڕی ( واسع) کرد بیکات به دادوەری بەسرە، بەڵام نەیکرد، دووبارە بانگی کردو وتی: دەبێ دابنیشی ئەگەر نا به قامچی لێت دەدەم، وتی: ئەگەر ئەوە بکەیت ئەوە تۆ دەسەلاَتداریت، بێگومان زەلیلی دونیا باشترە له زەلیلی دوا رۆژ.

(وهب)ی کوری(منبه) دەڵێت: ئەگەر دەسەڵاتداری وڵات ویستی ستەم بکات یا بەکردار کردی، ئەوە خوای گەورە قات و قڕی دەخاتە ولاَتەکەیە وە، له خواردەمەنی و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و هەموو شتێکی تردا، وەئەگەر ویستی چاکە بکات یا دادوەری بلاَو بکاتەوە ئەوە خوای گەورە فەڕو بەرەکەت دەخاتە وڵاتەکەیەوە.

یەکێك له کاربەدەستەکانی (عمر)ی کوری ( عبد العزیز) له (حمص) نامەیەکی بۆ نووسی: بەڕاستی شاری (حمص) وێران بووە و پێویستی به چاکسازی هەیە، (عمر) یش وەڵامی دایەوە وتی: بیپارێزە به دادوەری، ڕێگەو بانەکەی پاك بکەرەوە به ستەم نەکردن. والسلام.

حەرامە دادوەر بڕیار بدات له کاتی تووڕەییدا، وە ئەگەر له دادوەردا کەمی زانست و نیەتی خراپ و خوڕەوشتی ناشیرین و کەمی خۆپارێزی له حەرام کۆبوویەوە ئەوە زەرەرمەندو دۆڕاوە، ئەوکات پێویستە خۆی دەست لەکار بکێشێتەوە و دەستپێشخەری بکات له دڵسۆزیدا.

## ئامۆژگاری

ئەی ئەو کەسەی تەمەنی بەردەوام له کەم بوون دایە! ئەی ئەو کەسەی که بێباکە له (ملك الموت)، ئەی ئەو کەسەی که بەرز دەبێتەوە له بەندایەتی حەقدا، بەڵام کاتێك دەخرێتە بەر تاقیکردنەوەی دونیا دۆڕاو دەردەچێت! کێت هەیە له ڕۆژی حەشر و کاتێك نامەکەت هەڵدەدرێتەوە .

# تاوانی سی و دوو

# بەرتیل وەرگرتن

خوای گەورە دەفەرمویت : ﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾( البقرة: ١٨٨).

واتە: ماڵەکانتان بە بەرتیل مەدەن بە دەسەڵاتداران تا مافی کەسێکی تر دابڕن بۆ ئێوە، خۆتان ئەمە باش دەزانن کە حەڵاڵ نیە بۆتان.

(عبد الله)ی کوڕی (عمرو) دەڵێت:( لَعَنَ رسول اللّهِ صلى الله عليه وسلم الرَّاشِي وَالْمُرْتَشِي) واتە:پێغەمبەری خواﷺ نەفرەتی لەو کەسە کردووە کە بەرتیل دەدات و بەرتیل وەردەگرێت.

ئەو کەسەی کە بەرتیل دەدات نەفرەت دەیگرێتەوە ئەگەر مەبەستی پێی ئازاردانی موسڵمانێك بێت یا بیەوێت ماڵێکی بەناحەق لێ وەربگرێت. بەڵام ئەگەر بەرتیل بدات بۆ ئەوەی بگات بە مافێکی ڕاستەقینەی خۆی، یا ستەمێك لە خۆی دووربخاتەوە ئەمە ئەو هەڕەشەیە نایگرێتەوە، لە گەڵ ئەوەدا گومانی تێدا نیە دەسەڵاتدار بە هەر مەبەستێك بەرتیل وەربگرێت حەرامە.

## بەش

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( من شَفَعَ لِأَخِيه بِشَفَاعَةٍ فَأَهْدَى له هَدِيَّةً عليها فَقَبِلَهَا فَقَدْ أتى بَابًا عَظِيمًا من أَبْوَابِ الرِّبَا)(٢). واتە: ئەوەی تکاکاری بۆ براکەی بکات لەبری ئەوە دیاری وەربگرێت، ئەوە چووەتە دەرگایەکی گەورەوە لە دەرگاکانی ڕیبا .

## ئــامۆژگاری

بەندەکانی خوا، بیر لە دوارۆژ بکەنەوە، ئاگەداری هێزی چاکە بن، خۆتان بپارێزن لە سزای داهاتوو، بترسن لە تالآنی تالآنکەر، سوێند بەخوا ئەوەی بەدوای هەرچیدا بگەڕێ بەدەستی دێنێ، ئەی کوان ئەوانەی سەرگەردانی خۆشبەختی هەتاهەتایی بوون لە دونیادا !؟ کەچی نەبوو بە نسیبیان و بە جێیان هێشت .

## تاوانی سی و سێ

## خۆشوبهاندنی ئافرەتان بە پیاوان و پیاوان بە ئافرەتان

لە (صەحیحی) بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لَعَنَ الله الْمُتَشَبِّهَاتِ من النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ وَالْمُتَشَبِّهِينَ من الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ). واتە: خوا نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەشوبهێنن بە پیاوان و ئەو پیاوانەش کە خۆیان دەشوبهێنن بە ئافرەتان.

ئەگەر ئافرەت جل و بەرگی پیاوانی لەبەر کرد لە ڕووی قاڵب و تەسك و تروسکیەوە، ئەوە خۆی شوبهاندووە بە پیاوان لە جل و بەرگدا، نەفرەتی خوا و پێغەمبەرەکەی بەردەکەوێت، ئەگەر پیاوەکەی بێدەنگ بێت بەرامبەر ئەو ڕەفتارە ئەوە ئەویش بەر نەفرەتی خواو پێغەمبەر دەکەوێت، چونکە ئەو فەرمانی پێکراوە لەسەر ئەوەی ئامۆژگاری بکات لەسەر بەندایەتی خوای گەورە، دوورکەوتنەوە لە سەرپێچی وەك دەفەرموێت:﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ ﴾( التحريم: ٦). واتە: خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سوتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە.

مانای ئەوەیە کە پەروەردەیان بکەن و فێریان بکەن و فەرمانیان پێ بکەن بە بەندایەتی خوا و دووریان بخەنەوە لە سەرپێچیکردنی خوای گەورە، وەك چۆن خۆتانی لێ دووردەخەنەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مسؤول عن رَعِيَّتِهِ: الرَّجُلُ رَاعٍ في أهْلِهِ رَاعٍ ومسؤول عَنهُم يَومَ القِيَامَةِ ). واتە: هەمووتان شوانن و هەمووتان بەرپرسیارن لە شوانییەکەتان: پیاو بەرپرسیارە لە ناو ماڵ و منداڵیدا و بەرپرسیارە لێیان لە ڕۆژی دواییدا

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( صِنْفَانِ من أَهْلِ النَّارِ لم أَرَهُمَا: قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بها الناس وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلَاتٌ رؤوسهن كأسنمة الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ لَا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ ولا يَجِدْنَ رِيحَهَا، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ من مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا).
واتە : دوو كۆمەڵ هەن لە ئەهلی دۆزەخن نەمبینیون: كۆمەڵێك قەمچییان پێیە وەك كلكی مانگا وایە خەڵكی پێ فەلاقە دەكەن، ئافرەتانێكیش جل و بەرگێكی تەسك و تەنكیان لە بەردایە وێنەی ڕووتیان دەردەخات و بە لارو لەنجە ڕێدەكەن ( بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك بەلای خۆیاندا ڕابكێشن) پرچیان گەورە و جوان دەكەن لە پشتەوە دەیبەستن وەك كۆپارەی حوشتر، ناچنە بەهەشتەوە و بۆنیشی ناكەن، بێگومان بۆنی لە دووری ئەوەندە و ئەوەندە دەڕوات .

(كاسيات ) واتە: دوورن لە نیعمەتی خوا، ((عَارِيَات)) دوورن لە سوپاسكردنی خوا. وتراوە: بریتیە لەو جل و بەرگە تەنك و تەسكەی كە وێنەی ئافرەتەكە بەڕووتی نیشان دەدات.

(( مائلات )) وتراوە: لایان داوە لە بەندایەتی خوا . ((مُمِيلَات)) واتە: خەڵكی تر فێر كاری خراپ دەكەن، وتراوە: لە ڕێكردندا خۆیان با ئەدەن بەملاو ئەولادا، خەڵكیش فێری ئەو ڕێكردنە خراپە دەكەن.

((رؤوسهن كأسنمة الْبُخْت)) واتە: پرچیان گەورەو جوان دەكەن و لەپشتی سەریانەوە گرێی دەدەن وەك كۆپارەی حوشتر .

**ئەو كردارانەی كە ئافرەتان بەهۆیەوە نەفرەتیان لێ دەكرێت:**

دەرخستنی جوانی مرواری و زێڕ و زیو و بۆن خۆشكردن بە میسك و عەنبەرو عەتر ئەگەر لەماڵ دەربچێت، وە بۆیەكردنی دەم و چاو و خەنەكردنی دەست و پێكان و لەبەركردنی ئاوریشم و جلی تەسك و كورت لەكاتی دەرچووندا .

هەموو ئەمانە بەو خۆ جوانکردنەوە و خۆڕازاندن ئەژمار دەکرێن کە خوای گەورە خەشم و قینی دەڕێژێت بەسەر بکەرەکەیدا لە دونیاو دواڕۆژدا، ئەم کردارە لە ناو زۆربەی ئافرەتاندا باوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان دەفەرموێت:( اطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ). واتە: دۆزەخم پێنیشان درا بینیم زۆربەی خەڵکەکەی لە ئافرەتانن.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( ما تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً أضَرَّ على الرِّجَالِ من النِّسَاءِ).
واتە: دوای خۆم تاقیکارییم بۆ پیاوان جێ نەهێشتووە زیانی هەبێت لە ئافرەتان زیاتر.

## ئامۆژگاری

ئەی نەوەی ئادەم وابزانە لەناکاودا مردیت، گەیشتیت بە کاروانی مردووان ، گواسترایتەوە بۆ ماڵی تەنهایی و تاریکی ناو گۆر، تا کەی چاکەکانت وانامێنێت و خراپەکانت تازە دەبێتەوە، تاکەی سوود وەرناگریت لە ئامۆژگاری؟! ئەی نازانیت ڕۆژێکت لە پێشە کە زمان دەوەستێت و ئەندامەکانی جەستەت لێت دەبن بە شایەت.

## تاوانی سی و چوار
## بێ ئابڕوو ئەوکەسەیە کە خەڵکی بانگ دەکاتە لای خێزانی و ئەوکەسەیە دووکەس دەگەیەنێت بەیەکتر بۆ داوێن پیسی

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾( النور: ٣) . واتە: پیاوی زیناکەر تەنها ئافرەتی زیناکەر یاخود موشریك مارە دەکات، ئافرەتی زیناکەریش تەنها پیاوی زیناکەر یاخود موشریك مارەی دەکات، ( هاوسەرێتی پیاوان و ئافرەتانێك کە بەردەوامن لەسەر زینا )، ئەوە لەسەر ئیمانداران حەرامە.

وە لە ( عبدالله بن عمر ) – ڕەزای خوای لێبێت – لە پێغەمبەرەوە فەرموویەتی : ( ثَلَاثَةٌ لَا يَدْخُلُونَ الجَنَّةَ : العَاقُ لِوَالِدَيهِ، وَ الدَّيوثُ، وَرَجُلَةَ النِّسَاءُ )[1]. واتە: سێ تاقم ناچنە بەهەشتەوە: کەسێك سەرپێچی دایك و باوکی بکات، بێ ئابڕوو، وەئەو ئافرەتەی خۆی دەشوبهێنێت بە پیاوان .

هەرکەسێك بزانێت خێزانەکەی داوێن پیسی دەکات و بێدەنگ بێت لە ئاستیدا، جا ئەگەر لەبەر خۆشەویستی بێت، یا لەبەر ئەوەی قەرزاری ئەوەو ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە، یا لەبەر ئەوەیە کە مارەییەکەی زۆر قورسە لە توانایدا نیە، یا لەبەر ئەوەی منداڵی لێی هەیە ناتوانێت بەرهەڵستی لێ بکات، بەڕاستی ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەو پیاوە هیچ خێرێکی تێدا نیە .

تمضى حلاوة ما أخفيت وبعدها — تبقى عليك مـــرارة التبعات
يا حسرة العاصين يوم معادهـم — لـــو أنهم سبقوا إلى الجنــات
أو لم يكن إلا الحياء من الـــذى — ستر العيوب لا كثروا الحسرات

---

[1] – أحمد ١ \ ١٣٤، والحاكم في المستدرك ١ \ ٧٢ وصححه.

# تاوانی سی و پێنج

## حەلاڵ کەر و حەلاڵ بۆ کراو ( مارەبەجاش )

لە (عبد الله)ی کوڕی (مسعود)وە دەڵێت:( لَعَنَ رسول اللّٰهِ صلی الله علیه وسلم الْمُحِلَّ وَالْمُحَلَّلَ له). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لە حەلاڵ کەرو حەلاڵ بۆ کراو.

ئیمامی ( الترمذي ) دەڵێت : کارکردن لە سەر ئەم فەرموودەیە لای هەندێك لە ئەهلی عیلم لەوانە ( عمر) ی کوڕی ( الخطاب ) و ( عثمان ) ی کوڕی (عفان) و ( عبدالله) ی کوڕی (عمر )، ئەمە بۆچوونی زۆرێك لە زانایانی تابعینە، لە (عقبة بن عامر) ەوە دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (ألا أُخْبِرُكُمْ بِالتَّيْسِ الْمُسْتَعَارِ قالوا بَلَى يا رَسُولَ اللّٰهِ قال هو الْمُحَلِّلُ لَعَنَ الله الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ له). واتە: (ئایا ئاگادارتان بکەمەوە لە دروزنێکی ساختەچی) وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا. فەرمووی : ئەوە حەلاڵ کەرە، نەفرەتی خوا لە حەلاڵ کەرو حەلاڵ بۆ کراو، بەلاّم ئەوەی کە بە جێماوە لە بەسەرهاتی هاوەڵان و شوێنکەوتوانیان، پرسیار کرا لە ئیمامی عومەر دەربارەی حەلاڵ کردنی ئافرەت بۆ پیاوەکەی فەرمووی : بەڕاستی ئەو زینایە .

لە( ابن عباس) وە پیاوێك پرسیاری لێکرد وتی : برازاکەم خێزانەکەی سێ بە سێ تەلاّق داوەو ئێستا پەشیمانە، فەرمووی : برازاکەت لە فەرمانی خوا دەرچووە ئەویش پەشیمانی کردەوە، گوێڕایەڵی شەیتانی کردوو هیچ ڕێگایەکی نەهێشتەوە بۆ دەرباز بوون، وتی : ئەی چی دەڵێی دەربارەی پیاوێك بۆی حەلاڵ بکات، فەرمووی : ئەوەی بیەوێت خوا بخەڵەتێنێت ئەوە خوا بە توندی تۆڵەی لێ دەسێنێتەوە . (سعید بن مسیب) پێشەوای تابعین دەربارەی پیاوێك کە ئافرەتێکی خواستووەو دەیەوێت حەلاڵی بکات بۆ

پیاوی یەكەم، وتی : حەلاڵ نابێت . ئیسماعیلی كوڕی سەعید دەڵێت : پرسیارم لە ئیمامی ئەحمەد كرد دەربارەی پیاوێك كە ئافرەتێك دەخوازێت لە نیەتی دایە حەلاڵی بكاتەوە بۆ پیاوی یەكەم ئافرەتەكەش لەوە بێئاگایە ؟ فەرمووی : ئەوە حەلاڵ كەرە وە ئەگەر بیەوێت بەو شێوەیە حەلاڵی بكات ئەوە نەفرەت لێكراوە .

مەزهەبی ئیمامی شافعی – ڕەحمەتی خوای لێبێ – ئەگەر مەرجی حەلاڵ كردن لە ناو مارەبڕینەكەدا دیاری كرا ئەوە پووچ دەبێتەوە، لەبەرئەوە مارەبڕینێكە بە مەرجێكی بڕاوە بە بێ دیاری كردنی ئامانج ئەمەش پووچەو دانامەزرێت وەك زەواجی ( المتعة )، ئەگەر مەرجێك بە دیكرا پێش مارەبڕین بۆچوونی تەواو ئەوەیە كە دروستە، ئەگەر لە مارەبڕینەكەدا مەرجی تێدا نەبوو نە لەناو مارەبڕینەكەداو نە لە پێش مارەبڕینەكە ئەوا فاسد نابێت، وە ئەگەر گواستیەوە لەسەر ئەوەی كە ئەگەر حەلاڵی بكات ئەوە تەلاقی دەدات، زانایان دوو بۆچوونیان هەیە : ڕاسترینیان ئەوەیە كە دانامەزرێت :

لایەنی یەكەم: بەتاڵبوونەوە : ئەوە مەرجێكە بەرهەڵستی دەكات لە بەردەوامبوونی زەواج، بۆیە دەشووبهێتە دیاریكردنی كات لە زەواجدا ئەمەش بۆچوونی تەواوە لە لای ( الرافعي ) .

لایەنی دووەم : ئەوە مەرجێكی فاسیدە لە گرێبەست دەچێت بۆیە هەڵناوەشێتەوە وەك چۆن ئافرەتێك بخوازێ بەو مەرجەی كە ژنی بەسەردا نەهێنێت و لە گەڵیٚ سەفەر نەكات، والله أعلم .

## ئامۆژگاری

خۆشبەختی بۆ ئەو خەڵكەی وازیان لە دونیا هێناوە پێش ئەوەی دونیا وازلیٚ بهێنن(بمرن)، وە دڵیان لە تاریكی ئەو دەرهێناوە و دەستیان گرتووە بە ڕۆژگاری خێرو چاكەوە و چێژیان لە وتەی پەروەردگاریان وەرگرتوو و خۆیان داوەتی دەستی.

## تاوانی سی و شەش

## خۆپاكنەكردنەوە لە میز كە ئەوەش دروشمی گاورەكانە

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴾( المدثر : ٤ ) . واتە: پۆشاكت (دڵ و دەروونت، ڕەفتارت، هەرهەمووی) خاوێن بكە( خۆت و شوێنكەوتوانت ).

وە لە (ابن عباس ) – ڕەزای خوای لێبێ – دەڵێت:: (مَرَّ النبي صلى الله عليه وسلم بِقَبْرَيْنِ فقال إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وما يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ من الْبَوْلِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ) . واتە :پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی: ئەو دووانە سزا دەدرێن و لەبەر تاوانی گەورە سزا نادرێن، بەڵكو یەكەمیان خۆی پاك نەدەكردەوە لە میز، وە دووەمیان لە ناو خەڵكیدا قسەی دەهێناو دەبرد.

بێگومان ئەگەر كەسێك جەستەوجلی لە میز پاك نەكاتەوە ئەوە نوێژەكەی دروست نیە.

### ئامۆژگاری

ئەی بەندەكان بیر لەو كەسانە بكەنەوە كە دونیایان بەجێهێشت،وە قوڵ بوونەتەوە لە داهاتوویان نازانن بۆ كوێ دەچن، بزانن ئەوانە بەش بەش بوون و لە یەكتر جیا بوونەوە، بەڵام ئەهلی خێرو چاكە لە خۆشبەختیدان، ئەهلی خراپەكار لە زەرەرمەندی دان .

| | |
|---|---|
| أقول والنفس تدعوني لزخرفها | أين الملوك ملوك الناس والسوق |
| أين الذين إلى لذاتها جنحـــــوا | قد كـــــان قبلهم عيش ومرتفق |
| أمست مساكنهم قفرا مـــعطلة | كأنهم لــــم يكونوا قبلها خلقوا |
| يا اهل لذة دار لا بقاء لهـــــا | إن اغترارا بظل زائل حمـــــــق |

# تاوانی سی و حەوت

## ڕیـــایی

خوای گەورە دەربارەی مونافیقەکان دەفەرموێت :﴿ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾( النساء: ١٤٢). واتە: ئەوانە ڕیایی بۆ خەڵکی دەکەن، زۆر کەم یادی خوا دەکەن.

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ۝٦ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴾( الماعون : ٤ –٧). واتە: جا هاوارو واوەیلیٚ بۆ نوێژکەرانێك....ئەو نوێژکەرانەی گوێ نادەن بە نوێژەکانیان و کاریگەری نیە لەسەریان و دڵی نادەنیٚ و لێی غافڵن.... ئەوانەی کە ڕیابازن بە ڕووکەش نوێژ دەکەن و دەیانەوێت خۆیان دەربخەن و ( ئیمانداران بخەڵەتێنن). ( هەمیشە هەوڵ دەدەن بۆ ) قەدەغە کردنی هەموو چاکە و یارمەتی و کۆمەکی و هاوکاریەك.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُبْطِلُوا۟ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ كَٱلَّذِى يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ ﴾( البقرة : ٢٦٤). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن خێرو پاداشتی چاکەکانتان پووچ بکەنەوە بە منەت کردن و دڵ ئازاردانی ( هەژارن)، وەکو ئەوکەسەی ماڵ و سامانی خۆی لەبەر چاوی خەڵکی ببەخشێت بۆ ڕیایی و خۆنواندن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾( الكهف: ١١٠). واتە: جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد ببێت، با کارو کردەوەی چاك و دروست ئەنجام بدات و بەهیچ شێوەیەك لە پەرستنیدا هیچ کەسێك نەکاتە هاوەڵ و شەریك بۆی.

لە ( ابو هريرة ) – ڕەزای خوای لێبێ – فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( إِنَّ أَوَّلَ الناس يُقْضَى يوم الْقِيَامَةِ عليه رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قال فما عَمِلْتَ فيها قال قَاتَلْتُ فِيكَ حتى اسْتُشْهِدْتُ قال كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لِأَنْ يُقَالَ جَرِيءٌ فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ على وَجْهِهِ حتى أُلْقِيَ في النَّارِ وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قال فما عَمِلْتَ فيها قال تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ قال كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ عَالِمٌ وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ هو قَارِئٌ فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ على وَجْهِهِ حتى أُلْقِيَ في النَّارِ وَرَجُلٌ وَسَّعَ الله عليه وَأَعْطَاهُ من أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قال فما عَمِلْتَ فيها قال ما تَرَكْتُ من سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فيها إلا أَنْفَقْتُ فيها لك قال كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ هو جَوَادٌ فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ على وَجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ في النَّارِ)[1]. واتە: بەڕاستی یەكەم كەس كە دادوەری دەكرێت لە ڕۆژی دواییدا پیاوێكە شەهید بووە دەیهێنن و نیعمەتەكانی پێ دەناسێنن ئەویش دەیناسێتەوە، دەڵێت: چۆن كردارت پێیان كرد، دەڵێت: لەپێناوی تۆدا شەڕم كرد. دەڵێت: درۆت كرد بەڵكو كوشتارت كرد لەبەر ئەوەی بڵێن ئازاو بوێرە، بێگومان پێت وترا: پاشان فەرمانی پێدەكرێت لەسەر نێوچاوانی ڕایدەكێشن هەتا فڕێی دەدەنە ناو ئاگرەوە. وە پیاوێكی تر كە فێری زانست بووە و خەڵكی فێر كردووە و قورئانی خوێندووە، ئینجا دەیهێنن و نیعمەتەكانی پێ دەناسێنن ئەویش دەیناسێتەوە، دەڵێت : چۆن كردارت پێیان كرد، دەڵێت: فێری زانست بووم و خەڵكیشم فێر كرد و لەبەر تۆش قورئانم خوێند، دەڵێت: درۆت كرد، بەڵكو فێر بووی لەبەر ئەوەی پێت بڵێن زانایە، وە قورئانت خوێند لەبەر ئەوەی پێت بڵێن ئەو قورئان خوێنە، بێگومان پێت وترا، پاشان فەرمانی پێدەكرێت لەسەر نێوچاوانی ڕایدەكێشن هەتا فڕێی دەدەنە ناو ئاگرەوە. وە پیاوێك خوای گەورە ماڵێكی زۆری پێبەخشیوە و لە هەموو جۆرەكان بەهرەمەندی كردووە، ئینجا دەیهێنن و نیعمەتەكانی پێ دەناسێنن ئەویش دەیناسێتەوە، دەڵێت : چۆن كردارت پێیان كرد،

---

[1] – مسلم(١٩٠٥).

دەڵێت: هیچ ڕێگەیەکم بە جێ نەهێشتووە کە حەز بکەیت لەو ڕێگەدا بەخشین ئەنجام بدرێت ئیللا لەو ڕێگەوە بەخشیومە لە پێناو تۆدا، دەڵێت: درۆت کرد، بەڵکو ئەو کردارەت کردووە لەبەر ئەوەی پێت بڵێن بەخشندەیە، بێگومان پێت وترا: پاشان فەرمانی پێدەکرێت لەسەر نێوچاوانی ڕایدەکێشن هەتا فرێی دەدەنە ناو ئاگرەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ان أَخْوَفَ ما أخَافُ عَلَيْكُمُ الشِّرْكُ الأصْغَرُ قالوا وما الشِّرْكُ الأصْغَرُ يا رَسُولَ اللّهِ قال الرِّيَاءُ يقول الله عز وجل لهم يوم الْقِيَامَةِ إذا جُزِيَ الناس بِأعْمَالِهِمْ اذْهَبُوا إلى الَّذِينَ كُنْتُمْ تراؤون في الدُّنْيَا فَانْظُرُوا هل تَجِدُونَ عِنْدَهُمْ جَزَاءً). واتە: ((بەڕاستی ترسناکترین شت کە لێی دەترسم دووچاری ببن، شیرکی بچووکە)) وترا: ئەوە چیە ئەی پێغەمبەری خواﷺ ؟ فەرمووی: ڕیایی کردنە، خوای گەورە کاتێك کە پاداشتی بەندەکانی دەداتەوە بە کردارەکانیان دەفرمووێ: بڕۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کە ئێوە ڕیاییتان بۆ دەکردن بە کردەوەکانتان ئینجا ببینن ئایا پاداشت دەبینن لای ئەوان))

وە وتراوە دەربارەی ئەو دەقەی خوای گەورە کە دەفەرموێت:﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴾( الزمر :٤٧ ) . واتە: لە لایەن خواوە سزاو ئازار و ئەشکەنجەی وایان بۆ دەردەکەوێت کە هەرگیز بە تەمای نەبوون.

ئەوان کردەوەیان ئەنجام دەدا لە دونیادا بەو مەبەستەی کە بە چاکە بۆیان هەژمار بکرێت بەلاّم نەیان دەزانی بە تاوان بۆیان دەنووسرێت. هەندێك لە زانایانی سەلەف کاتێ ئەم ئایەتەیان دەخوێندەوە دەیان فەرموو: وای بۆ ئەو کەسانەی کە ڕیایی دەکەن.

## ئامۆژگاری

بەندەکانی خوا، بەڕاستی ڕۆژگارەکانتان کەمە، با ئەوەی کە لەتەمەندایە ئامۆژگاری ئەو کەسە بکات کە لە خۆی لە خوارترە، وە با بێ ئاگا هەستێت لە خەوی غەفلەت پێش ئەوەی کاروان بەڕێ کەوێت .

# تاوانی سی و هەشت

## فێربوون بۆ دونیاو شاردنەوەی زانست

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟ ﴾( فاطر: ٢٨ ) . واتە: لەناو بەندەکانی خودادا هەر زانایان لەخوا ئەترسن ،زانای خواناس، (ابن عباس) دەڵێت: مەبەستی ئەو زانایانەیە کە دروستکراوەکانم بە من دەترسێنن لە زانست و گەورەیی و عیزەت و دەسەلاتم.

( مجاهد والشعبي ) دەڵێن: زانا ئەوکەسەیە کە لەخوا بترسێت.

وە (الربیع)ی کوڕی( أنس) دەڵێت: ئەوەی لەخوا نەترسێت ئەوە زانا نیە. خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴾( البقرة: ١٥٩). واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە بەرنامەو ڕێنموویيە ئاشکرا ڕەوانە کراوی ئێمە دەشارنەوە کە ناردوومانە، دوای ئەوەی بۆ خەڵکیمان ڕوون کردۆتەوە لە کتێبەکاندا، ئا ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەکات و نەفرین کارانیش نەفرەتیان لێدەکەن.

ئەم ئایەتە دەربارەی زانایانی جولەکە دابەزی، مەبەست لە وشەی( البينات) ڕەجم و سنوورەکان و یاسا و ڕێساکانی ئیسلام دەگرێتەوە، وە(الهدى) فەرمانی پێغەمبەرﷺ و سیفەتە بەرزەکانی دەگرێتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴾( آل عمران: ١٨٧). واتە: (یاد بێنەرەوە ) کاتێك خوا پەیمانی وەرگرت لەوانەی کتێبیان پێ بەخشراوە کە

ڕوونی بكەنەوە بۆ خەڵكی و مەرامەكانی باس بكەن و نەیشارنەوە، كەچی خستیانە پشت خۆیان و بە نرخێكی هەرزان فرۆشتیان( ئەگەر هەموو دونیاش بێت، دینی بۆ بفرۆشی هەرزان فرۆشراوە و زەرەرێكی بێ سنوورە ) ئای كە شتێكی بێ نرخیان كڕیوە و دەستیان كەوتووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( من تَعَلَّمَ عِلْمًا ممَّا يبتغي بِهِ وَجْهُ اللَّهِ عز وجل لَا يَتَعَلَّمُهُ إلا لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا من الدُّنْيَا لم يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يوم الْقِيَامَةِ يَعْنِي رِيحَهَا)[1]. واتە: هەركەس فێری زانستێك بێت مەبەستی پێ ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، فێری نەبێت تەنها لەبەر ئەوە نەبێت لەو ڕێگەیەوە شتێكی لە دونیادا دەست بكەوێت، هەرگیز بۆنی بەهەشت ناكات لە ڕۆژی دواییدا .

وە یەكێك لە دوعاكانی پێغەمبەری خوا : ( أَعُوذُ بِكَ من عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ)[2]. واتە: خوایە پەنا ئەگرم بە تۆ لە زانستێك كە سوودی نەبێت .

لە ( أسامة) وە -ڕەزای خوای لێ بێت- دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو:( يُجَاءُ بِالرَّجُلِ يوم الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى في النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُهُ في النَّارِ فَيَدُورُ كما يَدُورُ الْحِمَارُ بِرَحَاهُ فَيَجْتَمِعُ أَهْلُ النَّارِ عليه فَيَقُولُونَ أَيْ فُلَانُ ما شَأْنُكَ أَلَيْسَ كُنْتَ تَأْمُرُنَا بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَانَا عن الْمُنْكَرِ قال كنت آمُرُكُمْ بِالْمَعْرُوفِ ولا آتِيهِ وَأَنْهَاكُمْ عن الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ)[3]. واتە: پیاوی وا دەهێنرێت و فڕێ دەدرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ورگ و ڕیخۆڵەی دێتە دەرەوە لە نێویدا دەسوڕێتەوە وەك چۆن گوێدرێژ بە دەوری بەرداشدا دەسوڕێتەوە، دۆزەخییان بە دەوریدا كۆدەبنەوەو پێی دەڵێن: ئێ فلان ئەوە تۆ بۆ لێرەیت و لێت قەوماوە؟ مەگەر تۆ فەرمانی چاكەت پێ نەدەداین، قەدەغەی گوناه و خراپەت لێ

---

[1] – أبو داود(٣٦٦٤)، وصححه الشيخ الألباني.

[2] – مسلم(٢٧٢٢).

[3] – البخاري(٣٢٦٧)، ومسلم(٢٩٨٩).

نەدەكردین؟ ئەویش دەڵێت: من فەرمانی چاكەم پێدەدان و خۆم نەمدەكرد، قەدەغەی گوناهو خراپەشم لیّ دەكردن بەڵام خۆم دەمكرد!!

## ئامۆژگاری

ئەی نەوەی ئادەم كەی بیر لە ئاكامی خۆت دەكەیتەوە، كەی كاتی بەجێهێشتنی ئەو كۆشكانە دێت؟! تا كەی بەدەوری پارە و ساماندا دەسوڕێیتەوە؟!، كوا ئەو كەسانەی پێش ئێوە لەناو كۆشك و تەلارەكاندا بوون؟! .

إنما الدنيا متـــــاع كــــــل ما فيها غرور

فتذكر هـــول اليوم فيه الــــــسماء تمور

# تاوانی سی و نۆ

## ناپاکی (الخيانة)

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾(الأنفال: ٢٧). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: خیانەت مەکەن لە خواو لە پێغەمبەرەکەیﷺ (بەوەی کەم تەرخەمیتان لە فەرمانبەرداریاندا)، هەروەها خیانەتیش مەکەن لە ئەمانەت و ڕاسپاردەکانتان کە پێتان دەسپێردرێت، لە کاتێکدا کە ئێوە دەزانن( ئەو کارەتان خیانەتە ).

( الواحدي) - ڕەحمەتی خوای لێ بێت – دەڵێت( ١: ئەم ئایەتە دەربارەی( أبو لبابة ) دابەزی کاتێك کە ناردی بۆ ( بني قريظة )ئەو کاتەی کە گەمارۆی دابوون، ماڵ و منداڵەکانی لە ناو ئەواندا بوو، وتیان ئەی ( أبو لبابة ) چی دەڵێیت ئەگەر ئێمە ڕازی بین بە دادوەری ( سعد ) لە نێوانمان؟ (أبو لبابة ) دەستی برد بۆ ملی ئاماژەی پێ کرد، بەمانای سەربڕین کاری وا نەکەن، ئەوە خیانەتێك بوو لە لایەن ئەوەوە لە خواو پێغەمبەرﷺ.

( أبو لبابة ) دەڵێت:قاچەکانم لە جێگەی خۆی نەدەجولا کاتێ زانیم کە خیانەتم لە خواو پێغەمبەرەکەیﷺ کردووە.

مانای ﴿وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ واتە: خیانەت لە ئەمانەتەکانتان مەکەن.

(ابن عباس ) دەڵێت: ڕاسپاردەکان ئەو کردەوانەن کە خوای گەورە فەرمانی کردووە جێبەجێی بکەن، مەبەستی نوێژەکانە، دەڵێت: پشت گوێی نەخەن.

وە ﴿ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ واتە: خۆتان دەزانن ئەوە ئەمانەتێکە لە گەردنتان بەبێ گومان .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إذا حَدَّثَ كَذَبَ، وإذا وَعَدَ أَخْلَفَ، وإذا أؤتمن خَانَ[٢].واتە: نیشانەی دووڕوو سێ شتە: ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات، وە ئەگەر بەڵێن و پەیمانێکی دا نەیباتە سەر، ئەگەر ئەسپاردەی لەلا دانرا خیانەتی لێ بکات .

خیانەت لە هەموو شتێکدا ناشرینە، هەندێکی لەوی تر خراپترە، ئەوەی خیانەتت لێ دەکات لە سەروەت و ساماندا وەك ئەوە نیە کەخیانەتت لێ بکات لە ماڵ خێزانتدا

وە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموویەتی: ( أَدِّ الْأَمَانَةَ إلى من ائْتَمَنَكَ ولا تَخُنْ من خَانَكَ)([٢]). واتە: ڕاسپاردە وئەمانەت بدەوە ئەوکەسەی لای تۆی داناوە، خیانەتیش لە کەسێك مەکە کە خیانەتی لێ کردووی.

( ابن مسعود) دەڵێت: نوێژ ئەمانەتە، دەست نوێژیش ئەمانەتە و غوسڵیش ئەمانەتە، کێشانەو پێوانە ئەمانەتە، گەورەتر لەوانە ئەسپەردەکانە.

## ئامۆژگاری

بەندەکانی خوا، چی لە کات گرنگترە ئێوە بەفیڕۆتان داوە! نەفس و ئارەزوو چەند خراپە ئێوە بە گوێی دەکەن، پرسیاری ورد لە ئێوە دەکرێت ئەو ماڵە چۆن کۆتان کردوەتەوە!، نامەکان پارێزراوە بەکردەوەکان پڕ کراوەتەوە بیر بکەنەوە چیتان بەجێهێشتووە.

[٢] – البخاري( ٢٦٨٢)، ومسلم(٥٩).

[٢] – أبو داود(٣٥٣٤)، والترمذي(١٢٦٤)، والدارمي(٢٥٩٧)، والحاكم في المستدرك( ٢ \ ٤٦).

# تاوانی چــل

## منەت کردن

خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ ﴾( البقرة : ٢٦٤). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، نەکەن خێرو پاداشتی چاکەکانتان پووچ بکەنەوە بە منەت نان و دڵ ئازاردانی (هەژاران).

(الواحدي ) دەڵێت: مەبەستی ئەوکەسەیە کاتێك کە چاکەیەك دەکات منەت دەکات بەسەریدا، لە فەرموودەی (صەحیحدا) هاتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:( قال ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ الله يوم الْقِيَامَةِ ولا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ ولا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمُسْبِلُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ )[1]. واتە: سێ کەس خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات و نە پاکیان دەکاتەوە لە ڕۆژی دواییدا سزایەکی بە ئێشیان بۆ دەبێت: ئەوکەسەی کە دەرقاچەکەی درێژە، ئەوکەسەی کە منەت دەکات بەسەر خەڵکیدا، ئەو کەسەی ماڵەکەی زیاد دەکات بە سوێندی درۆ ).

(الْمُسْبِل) : ئەوکەسەیە کە دەرپێی درێژ دەکات هەتا دەگاتە خوار قاپە ڕەقەی، لەبەرئەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ما أَسْفَلَ من الْكَعْبَيْنِ من الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ)[1]. واتە :هەر بەرگێ لەبەر مرۆڤدا لە دوو قوولەپێ دابەزێ ئەوە دەکەوێتە ئاگری دۆزەخەوە[2].

---

[1] – مسلم(١٧١)

[1] – البخاري(٥٧٨٧).

[2] – مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە لەبەرکردنی پۆشاکی درێژ بۆ فیز و خۆبەزلزانیی بە زەویدا بخشێ قەدەغەکراوە. واتای فەرموودەکەی سەرەوە بە چەند فەرموودەیەکی تری ( صحیح) تەواو دەبێ، یەکێکیان ئەوەیە کە دەفەرموێ: (من جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لم يَنْظُرْ الله إليه يوم الْقِيَامَةِ) واتە: هەرکەس جل و بەرگی شۆڕبێ و بەسەر زەویدا لەبەر فیزو لە خۆبایی بوون بکشێ، خوا لە ڕۆژی دواییدا سەیری ناکات. لێرەدا (أبو بكر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا() من لایەکی لیباسو جلەکەم

(ابن سيرين) گوێی لە پیاوێك بوو بە کەسێکی تری دەوت: ئەی چاکەم بۆت نەکرد ئەی ئەوەو ئەوەم بۆت نەکرد، (ابن سيرين) پێی وت: بێدەنگبە هیچ خێرێك لە چاکە کردندا نامێنی ئەگەر خاوەنەکەی باسی بکات.

لا تحملن مـــــن الأنام  بـــأن يمنوا عليك منه
و اختر لنفســــك حظها  و اصبر فإن الصبر جنه
منن الرجال عـلى القلوب  أشـــد من وقع الأسنة

## ئامۆژگاری

ئەی ئەو کەسەی دەستپێشخەری دەکەی بەتاوان چەندە نەفامێت، تا کەی سەرپێچی فەرمانەکان دەکەیت، کوا ئەو کەسەی کە بەرز بوەوە لەنازو و نیعمەتدا ژیا؟ سوێند بەخوا ئەستێرەی گەشی ئاوا بوو، ئەی کوا ستەمکارو لووت بەرزەکان؟ کەسێکی تر بووبە خاوەن داری ماڵەکانیان .

شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر هەمیشە ئاگام لێبێت؟ پێغەمبەر () فەرمووی : ( إِنَّكَ لَسْتَ تَصْنَعُ ذلك خُيَلَاءَ). واتە: تۆ لەبەر فیز و خۆبەزل زانین ئەوە ناکەیت... ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونە کە مەبەست لە درێژکردنەوە ئەوەیە کە لەبەر فیز بێ و خاوەنەکەی لەخۆبایی بوونی پێوە دیار بێت .

# تاوانی چل و یەك

## بەدرۆخستنەوەی قەدەر( التكذيب بالقدر)

خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾( القمر : ٤٩). واتە: بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە.

(ابن الجوزي) لە تەفسیرەکەیدا لە هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەدا دەڵێت: دوو بۆچوون هەیە:

یەکەم: بتپەرستەکانی مەککە هاتن مشت و مڕی قەدەریان لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ دەکرد ئەم ئایەتە دابەزییە خوارەوە.

دووەم: (أسقف نجران) هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی (محمد) بڕوات وایە کە تاوان بە قەزاو قەدەرە و بەوشێوەیەش نیە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:( أَنْتُمْ خُصَمَاءُ اللهِ ) واتە: ئێوە دوژمنی خوای گەورەن. دواتر ئەم ئایەتە دابەزی:﴿ إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ (٤٧) يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ (٤٨) إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾( القمر: ٤٧- ٤٩ ). واتە: بەڕاستی تاوانبارو تاوانکاران لە گومڕایی و شێتیەکی زۆردا ڕۆچوون. ڕۆژێك دێت کە لە سەر ڕوویان ڕادەکێشرین لە ناو ئاگری دۆزەخدا، پێیان دەوترێت: دە بچێژن تاڵاوی دۆزەخ. بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازەو نەخشەی دیاریکراو دروست کردووە.

ئیمامی موسلیم لە (صەحیحە)کەیدا هێناویەتی لە ( ابن عمر) وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ( كُلُّ شَيْءٍ بِقَدَرٍ حتى الْعَجْزِ وَالْكَيْسِ)(٢). واتە: هەموو شتێك بە قەزاو قەدەرە تەنانەت لاوازی و بێ هێزی و ژیری و زیرەکیش.

خوای گەورە دەفەرمویت:﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾( الصافات: ٩٦) .

(ابن جرير) دەڵێت: دوو مانای هەیە:

یەکەم: دەبێت بەواتای (المصدر) هاتبێت، ئەوکات ماناکەی بەم شێوەی لێ دێت، ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ واتە: خوای گەورە ئێوەو کردەوەکانتانی دروست کردووە.

دووەم: یا دەبێت بە مانای (الذي) هاتبێت، ئەوکات ماناکەی بەم شێوەی لێ دێت، ( والله الذي خلقكم وخلق الذي تعملونه بأيديكم من الأصنام) واتە: ئەو خوایەی کە دروستی کردوون و ئەو کردارەی کە دەیکەن لە دروست کردنی بتەکاندا هەر ئەو دروستی کردووە. کەواتە ئەم دەقە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کرداری مرۆڤەکان خوای گەورە دروستی کردووە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴾( الشمس: ٨ ) . واتە: توانای خراپەو چاکەو خواناسی تێدا دابین کردووە.

(إلهام) سروش: دروست بوونی شتێکە لە دڵدا، ( ابن زيد ) دەڵێت: خوای گەورە بە یارمەتی خۆی ئەو دڵەی فەراهەم هێناوە بۆ تەقوای خوا، هەر بە یارمەتی خۆی فەراهەمی هێناوە بۆ خراپەکاری. والله أعلم.

لە فەرموودەکەی (جبريل) دا هاتووە پرسیاری کرد لەپێغەمبەر ﷺ: ئیمان چیە ؟ فەرمووی : ( أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ)[٢]. واتە: ئەوەیە کە بڕوا بهێنیت بە خواو فریشتەکان و کتێبە ئاسمانیەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و بڕوا بهێنیت بە قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕی.

(أن تؤمن بالله): بڕوا هێنان بەخوا بریتیە لە: دانپێدانان بەوەی کە خوای گەورە بوونی هەیەو وەسف کراوە بە سیفاتی گەورەیی و مەزنی و تەواو، دوورە لە سیفاتی ناتەواوی،

---

[٢] – مسلم(٨)، وأبو داود (٤٦٩٥)، والترمذي(٢٦١٠).

خوای گەورە تاکە، بێ نیازە، درووستکەری هەموو بوونەوەرەکانە، هەرچی بیەوێت دەیکات .

بڕواهێنان بە فریشتەکان (الملائكة) بریتیە لە: دانپێدانانی بەندایەتی ئەوان بۆ خوای گەورە:﴿ وَقَالُوا اتَّخَذَ الرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَانَهُ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ ﴾( الأنبياء : ٢٦- ٢٨ ). واتە: خوانەناسان دەیانوت: خوای میهرەبان کوڕی بۆ خۆی بڕیارداوە( فریشتەکان ڕۆڵەی ئەون)، پاکی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە، بەڵکو ئەوانە بەندەی ڕێزداری ئەون. ( ئەو فریشتانە ئەوەندە ڕەوشت بەرزن ) هەرگیز ( نافەرمانی ناکەن ) قسە لە قسەیدا ناکەن و لە گوفتاردا پێشی ناکەون، ئەوانە بە فەرمانی ئەو دەجوڵێنەوە و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەن. هەر خوا دەزانێت ئەو خەڵکە لە ڕابردوودا چیان ئەنجامداوە و لە داهاتووشدا چی ئەنجام دەدەن( دونیاو قیامەت، ڕابردوو داهاتوو، بۆ ئەو زاتە چوونیەکە )، فریشتەکانیش تکاکار نابن تەنها بۆ ئەو کەسانە نەبێت خوا پێی ڕازییە و ئەو فریشتانە لە ترسی ئەو زاتە ناوێرن هیچ سەرپێچیەك ئەنجام بدەن.

بڕواهێنان بە پێغەمبەران بریتیە لە: دانپێدانان بەوەی کە بەڕاستی ئەوان ڕاستگۆن لە هێنانی پەیامەکەیان لە لایەن خواوە، خوای گەورە یارمەتیداون بە موعجیزات کە لە توانای مرۆڤدا نیە، بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ئەوان، بەڕاستی ئەوەی لە ئەستۆیاندا بوو لە گەیاندنی پەیامەکانی خوای گەورە و ئەوەی فەرمانی پێ کردوون گەیاندیان بەبێ کەم و کوڕی،هەر بۆیە پێویستە ڕێزی تەواویان لێ بگیرێت و جیاوازی لە نێوانیاندا نەکرێت.

بڕوا هێنان بە ڕۆژی دوایی: بریتیە لە باوەڕی تەواو بەڕۆژی دوایی و گەڕانەوەی مرۆڤەکان بۆ لێپرسینەوە دوای مردنیان، بڕواهێنان بە: زیندوبونەوە و کۆبوونەوە لە گۆڕەپانی لێپرسینەوەدا ، تەرازوو پردی (صراط)، بەهەشت و دۆزەخ، ئەویێ جێگەی پاداشت و سزایە بۆ چاکەخوازان و خراپەکاران و و هەموو ئەوانەی کە بە دەقی فەرموودە سەلمێنراوە.

بڕوا هێنان بە (القدر) بریتیە لە: دانپێدانان بەوانەی كە پێشتر باسمان كرد، بەڵگەی هەموو ئەوانە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾( الصافات: ٩٦).

هەروەها ئایەتی:﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾( القمر: ٤٧- ٤٩ ) .

وە لەو بارەشەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( وَاعْلَمْ أَنَّ الْأُمَّةَ لو اجْتَمَعَتْ على أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لم يَنْفَعُوكَ إلا بِشَيْءٍ قد كَتَبَهُ الله لك وَلَوْ اجْتَمَعُوا على أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لم يَضُرُّوكَ إلا بِشَيْءٍ قد كَتَبَهُ الله عَلَيْكَ رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ وَجَفَّتْ الصُّحُفُ ). واتە: بزانە بەڕاستی هەموو مرۆڤایەتی ئەگەر كۆ ببنەوە لەسەر ئەوەی سوودت پێ بگەیەنن بە شتێك ناتوانن سوودت پێ بگەیەنن ئیللا بە شتێ نەبێ كە خوا لە چارەتی نووسیبێ، وە ئەگەر هەموو مرۆڤایەتی كۆ ببنەوە لەسەر ئەوەی زیانت پێ بگەیەنن ناتوانن زەرەرت لێ بدەن مەگەر بەشتێ نەبێ كە خوا لە چارەتی نووسیبێ، قەڵەم بەرز كرایەوە و مەرەكەبی پەڕاو وشك بوو.

بۆچوونی زانایانی كۆن و تازە (السلف والخلف) بەگشتی ئەوەیە كە هەركەسێك لەناخی دڵیەوە بڕوای تەواوی بەوانە هەبێت كە باسمان كرد بەبێ گومان و دوودڵی، ئەوە ئەو كەسە بڕوادارە، جا ئەگەر لە ڕێگەی بەڵگەی سەلمێنراوەوە بێت یا باوەڕی تەواو. والله أعلم.

## بەشێك

یەك دەنگ بوونی حەفتا پیاو لە پێشەوایانی موسڵمانان لە تابعین و سەلەف و زانایانی تر لەسەر ئەوەی ئەو سوننەتەی كە پێغەمبەری ئیسلام لەسەری كۆچی دوایی كرد یەكەمیان: ڕازی بوون بووە بە قەزاو قەدەر، خۆ دانە دەستی فەرمانەكانی خوای گەورە، ئارام گرتن لەسەر جێبەجێ كردنی فەرزەكان، بڕوا هێنان بە قەزاو قەدەر خێر و شەڕی، وازهێنان لە دووڕوویی و مشت و مڕی بێ مانا و دوژمنایەتی كردن لە دیندا، (مسح) كردن لە سەر (خوف)، جیهاد كردن لە گەڵ هەموو خەلیفەیەكدا باش بێت یان خراپ، نوێژ كردن لەسەر هەموو مردوویەكی لە ئەهلی قیبلە (موسڵمان).

## كەڵك و سوود

هەندێك لەوتەكانی خەڵك كوفرە زانایان بە ڕوونی ئامارەیان پێ كردووە

لەوانە:

**ئەگەر گاڵتە بە ناوێكی پیرۆزی خودا یا فەرمانێكی خودا یا پەیمانێكی خودا بكا، كافر دەبێت**

- ئەگەر بڵێ : ئەگەر خوا فەرمانێكم پێ بكات بە عەقڵمەوە نەچێ نایكەم، ( كافر دەبێت ).
- یا بڵێ : ئەگەر قیبلە لەو ڕووەی ترەوە بوایە ڕووم تێ نەدەكرد، (كافر دەبێت ).
- ئەگەر پێی بوترێت: واز لە نوێژ مەهێنە دوایی خوا لێت توڕە دەبێت، دەڵێت: ئەگەر سزام بدات لەسەر ئەم نەخۆشی و ناڕەحەتیە ئەوە ستەمم لێ دەكات، (كافردەبێت ).
- ئەگەر بڵێ: ئەگەر پێغەمبەران و فریشتەكانیش شایەتی بدەن هەر بڕوا ناكەم، ( كافر دەبێت ).
- ئەگەر پێی بوترێت: نینۆكت بكە چونكە سوننەتە، دەڵێت: ئەگەر سونەتیش بێت نایكەم، (كافر دەبێت ).
- ئەگەر بڵێت: فلان كەس لەبەرچاوم وەك جولەكەیە، كافر دەبێت.
- ئەگەر بڵێت: خوای گەورە بۆ ئەوە دانیشتووە بە ویژدان بێت،یا بۆ ئەوە هەستاوە كە بە ویژدان بێت. (كافر دەبێت ).
- كەسێك بە موسڵمانێك بڵێت: خوای گەورە ئاخیرەتت بە خێر نەگێرێت، یا ئیمانت لێ بسەنێت. (كافر دەبێت ).
- یا كەسێك بیەوێت تۆمەتبارێك سوێند بدات، ئەویش بیەوێت سوێند بەخوا بخوات، پێی بڵێت: نەخێر دەبێ سوێند بە تەلاقت بخۆی. (كافر دەبێت ).

- جیاوازیان هەیە لەوەی کە کەسێك بڵێت: بینینی تۆ بەلامەوە وەك بینینی مردن وایە، هەندێکیان دەڵێن. (كافر دەبێت).
- ئەگەر بڵێت: ئەگەر فلان کەس پێغەمبەر بێت ئیمانی پێ ناهێنم، (كافر دەبێت).
- ئەگەر بڵێت: ئەگەر ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ وتبێتی ڕاست بێ، ئەوە ڕزگارمان بووە. ( كافر دەبێت).
- ئەگەر بەبێ دەستنوێژ نوێژ بکات بە گاڵتە جاڕی، یا بە حەلاڵی بزانێت، (كافر دەبێت).
- ئەگەر دوو کەس دووبەرەکی کەوتە نێوانیانەوە یەکێکیان وتی: لاحول ولا قوة الا بالله، ئەوی تریان وتی: لاحول ولا قوة الا بالله، تینوێتی ناشکێنی یا تێرمان ناکات ( كافر دەبێت).
- ئەگەر گوێی لە دەنگی بانگدەر بوو بڵێت ئەوە درۆ دەکات! (كافر دەبێت).
- ئەگەر بڵێت: لە قیامەت ناترسم. (كافر دەبێت).
- ئەگەر پارەکەی دابنات و بڵێت: ئەوە دام بەدەست خوای گەورە، کەسێك پێی بڵێت: داتە بەدەست کەسێکەوە ناتوانێت شوێنی دز بکەوێت. (كافر دەبێت).
- ئەگەر کەسێك بچێتە شوێنێکی بەرز و خۆی بشوبهێنێت بە وتاربێژ، هاوڕێیەکانی بە گاڵتەجاڕیەوە پێی پێبکەنن و پرسیاری لێ بکەن و یەکێکیان بڵێت: قاپێکی نان تێکوشە لە خوێندن باشترە. (كافر دەبێت).
- ئەگەر کەسێك تووشی بەلاو موسیبەت بێت بڵێت: ماڵ و منداڵمت لەناودا ئیتر چی دەکەی ! . (كافر دەبێت).
- ئەگەر بدات لە منداڵەکەی و کەسێك پێی بڵێت: بۆ وائەکەی موسڵمان نیت تۆ؟! بڵێت: نەخێر. ( كافر دەبێت).
- ئەگەر ئاوات بخوازێت کە خوا زیناو ستەم و کوشتنی قەدەغە نەکردایە. ( كافر دەبێت).

- ئەگەر حەبلێك ببەستێت بەناوقەدیەوە، کەسێك بلێت: ئەوە چیت بەستووە بەناو قەدتەوە؟ بلێت: ئەمە (زنار)[١]. زۆربەی زانایان دەلێن: (کافر دەبێت).
- ئەگەر مامۆستایەك بلێت: جولەکە لە موسلمان باشترە، لەبەر ئەوەی موچەی باش دەدەن بە مامۆستاکانیان. (کافر دەبێت).
- ئەگەر بلێت: نەصرانیەك لە ئاگرپەرستێك باشترە. (کافر دەبێت).
- ئەگەر بەکەسێك بوترێت: ئیمان چیە؟ بلێت: نازانم. (کافر دەبێت).
- هەروەها ئەو وشانەش کە خراپ و نامۆن وەك: ئایینت نیە، ئیمانت نیە، یەقینت نیە، تۆ خراپەکاریت، تۆ دووڕوویت، تۆ زەندیقیت، تۆ فاسقیت، وە ئەوەی هاوشێوەی ئەمانەیە دەکرێت ئەو کەسە بەهۆی بەکار هێنانی ئەو وشانەوە ئیمانی لەدەست بدات و بچێتە دۆزەخ.

---

[١] – زنار: ئەو حەبلەیە کە ئاطر ئەرست و نەصرانیەکان دەیبەستن بەناو قەدیانەوە.

# تاوانی چل و دوو

## گوێ گرتن لە خەڵکی وئەوەی کە دەیشارنەوە

خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَلَا تَجَسَّسُوا ﴾( الحجرات : ١٢ ). واتە: سیخوڕی مەکەن.

(ابن الجوزي) دەڵێت: ( أبو زيد ) و ( الحسن ) و (الضحاك) و (ابن سيرين) ئەم دەقەیان بە( الحاء) خوێندوەتەوە.

(أبو عبيدة) دەڵێت: ( التجسس والتحسس) یەك مانایان هەیە – ئەویش بریتیە لە گەڕان – وەك سیخوڕی کردن .

( يحيى بن ابي كثير)دەڵێت: (التجسس) بریتیە لە گەڕان بەدوای عەیب و عاری خەڵکدا. وە( التحسس ) بریتیە لە گوێ گرتن لە قسەی خەڵك.

زانایانی تەفسیر دەڵێن: ( التجسس ) بریتیە لە گەڕان بە دوای عەیب و عار و ناموسی موسڵمانانداا. واتە: با هیچ کەس لە ئێوە چاودێری عەیب و عاری براکەی نەکات تا پێی بزانێت ئەگەر خوا بۆی پۆشیوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( وَمَنْ اسْتَمَعَ إلى حديث قَوْمٍ وَهُمْ له كَارِهُونَ أو يَفِرُّونَ منه صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْآنُكُ يوم الْقِيَامَةِ). واتە: هەرکەس گوێ لە قسەی نهێنی خەڵك بگرێت کە پێیان ناخۆش بێت لە قیامەتدا قوڕقوشمی تواوە دەکەنە گوێیانەوە.

### ئامۆژگاری

ئەی بەندەکانی خوا مردن نزیك بووەتەوە، وەك گیانێکی بارمتە ئامادە و ماندوو بووە، ئەی ئەو جەستەی کە ئامادەیت بێگومان دڵیش بێ ئاگایە، ئایا ڕازیت خێرو چاکەت دەست نەکەوێت .

# تاوانی چل و سێ

## دوو زمانی کردن و، قسە هێنان و بردن( النمام )

مەبەست ئەو کەسەیە کە قسە لەناو خەڵکدا دەهێنێت و دەبات بۆ ئەوەی دووبەرەکی و ناکۆکی بخاتە نێوانیان.

ئەمە لەڕووی شەرعەوە قەدەغەیە بە یەکدەنگی زانایان، بەڵگەی زۆر لەسەر قەدەغەکردنی هاتووە لە قورئان و سوننەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ۝ هَمَّازٍ مَّشَّآءٍ بِنَمِيمٍ ﴾( القلم: ١٠، ١١ ). واتە: بەقسەی ئەوانە مەکە کە زۆر سوێند دەخۆن و زۆر سووك و ڕیسوان .... ئەوانەی کە بەشوێن عەیب و عاردا دەگەڕێن و دووزمانی دەکەن و فیتنە دەگێڕن و حەزیان لە ئاشووبە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ). واتە: ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك قسە بهێنێت و قسە ببات.

وە لە (ابن عباس ) – ڕەزای خوای لێبێ – دەڵێت:: (مَرَّ النبي صلى الله عليه وسلم بِقَبْرَيْنِ فقال إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وما يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ من الْبَوْلِ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ فَغَرَزَ في كل قَبْرٍ وَاحِدَةً قالوا يا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ فَعَلْتَ هذا قال لَعَلَّهُ يُخَفِّفُ عنهما ما لم يَيْبَسَا). واتە:پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕدا تێپەڕی و فەرمووی: ئەو دووانە سزا دەدرێن ،بەڵام لەبەر تاوانی گەورە سزا نادرێن، بەڵکو یەکەمیان خۆی پاك نەدەکردەوە لە میز کردن، وە دووەمیان لە ناو خەڵکیدا قسەی دەهێناو دەبرد، پاشان لقێکی تەڕی دارخورمای هەڵگرت و کردی بە دوو

لەتەوە لەسەر هەر قەبرێكیان دانەیەكی چەقاند و فەرمووی: بەڵكو سزایان لەسەر سووك دەبێت هەتا وشك ئەبێتەوە.

وە (وما يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ ) واتە: نەكردنی قورس نەبووە بەسەریانەوە، یا لە بۆچوونیاندا نەكردنی ئەوەندە گەورە نیە،لە (أبو هريرة)وە- ڕەزای خوای لیَ بێت – دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :( تَجِدُونَ شَرَّ الناس ذَا الْوَجْهَيْنِ الذي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ وَيَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ)[١].واتە: خراپترین خەڵك دووڕووەكانن، دێن بۆ لای هەندێك بەڕوویەكەوە، بۆلای هەندێكی تریش بە ڕوویەكی ترەوە.

ئیمامی( أبو حامد الغزالي ) دەڵێت: زۆر جار (نميمة) بەوە دەوترێت كە قسەی كەسی یەكەم بۆ كەسی دووەم دەبات، وەك دەڵێت: فلاَن كەس دەربارەی تۆ وادەڵێت.

دووزمانی تەنها بریتی نیە لەوە بەڵكو سنووری ئاشكراكردنی شتێكە كەسی بەرامبەر پێی ناخۆش بێت، جا یەكسانە ئەمە بە وتە بێت یا بە نووسین، یا بە هێما یا بە ئاماژە یا هاوشێوەی ئەمانە، یەكسانە ئەمەش پسە یا كردار بێت یا كارێكی شوورەیی یا هیتر بێت .

حەقیقەتی دووزمانی: ئاشكراكردنی نهێنی و ئابڕووبردنێتیَ، پێویستە لە سەر مرۆڤ بێدەنگ بێت لەسەر هەر شتێك دەیبینێت كە پەیوەندی بە ژیانی تاكەكانی خەڵكەوە هەیە، مەگەر لەباسكردنیدا سوودێكی گشتی هەبێت بۆ موسڵمانان.

هەموو كەسێك دووزمانیەك بدرێتە پاڵی و پێی بوترێت: فلاَن كەس ئاواو ئاوای پیَ وتویت، پێویستە شەش حاڵەت ڕەچاو بكات:

یەكەم: باوەڕی پیَ نەكات، چونكە دووزمان فاسیقە و بڕوای پیَ ناكرێت.

دووەم: دەبێت بەرهەڵستی لەو كارە قیزەونە بكات، ئامۆژگاری بكات بە دووبارە نەكردنەوەی ئەو كردارە ناشرینە.

---

[١] – البخاري(٣٤٩٤)، ومسلم(٢٥٢٦).

سێیەم: لەبەر خوا بیبوغزێنێت و ڕقی لێ بێت، چونکە ئەوکەسە لای خوای گەورە بوغزێنراوە، ڕق لێبونەوەش لەبەر خوا ئەرکەو واجبە.

چوارەم: نابێت گومانی خراپ بۆ ئەو کەسە ببات کە دووزمانی بەدەمەوە کراوە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ ﴾( الحجرات: ١٢). واتە: ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە، خۆتان بپارێزن لە زۆر گومانی خراپ، لەڕاستیدا هەندێ لەو گومانانە گوناهو تاوانن.

پێنجەم : نابێت ئەمە وای لێ بکات بۆ ئەوەی بگات بە حەقیقەتی قسەکە، هەستێت بە جاسوسی کردن بەسەر خەڵکەوە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَلَا تَجَسَّسُواْ ﴾

شەشەم : چۆن بۆ خۆی پێی ناخۆشە دووزمانی بەسەرەوە بکرێت، بەهەمان شێوەش بۆ خەڵکی پێی ناخۆش بێت .

پیاوێك هات بۆ لای ( عمر)ی کوڕی(عبد العزیز) – ڕەزای خوای لێبێ- باسی کەسێکی تری بۆی کرد، ئەویش وتی: ئەگەر تەماشای قسەکەت بکەین، دەبینین: ئەگەر درۆ بکەیت ئەوە لەم کۆمەڵەی کە خوای گەورە باسیان دەکات:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴾ (الحجرات: ٦ ). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێ نەکراو هەواڵێکی گرنگی بۆ هێنان، خێرا بڕوای پێ مەکەن، بەڵکو سەرنج بدەن، لێی بکۆڵنەوە تا بۆتان ڕوون دەبێتەوە.

وە ئەگەر ڕاست بکەیت ئەوا لەم کۆمەڵەی کە خوای گەورە باسی دەکات ﴿ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴾ ( القلم: ١١ ). واتە : عەیب لە خەڵك ئەگرێ و قسە دێنی و دەبات و لەناو خەڵكا فیتنە دەنێتەوە . ئەگەر حەز دەکەیت لێت خۆش دەبین، وتی: لێخۆش بوون ئەی ئەمیری بڕواداران، هەرگیز جارێکی تر ناگەڕێمەوە بۆ ئەم کارە.

## ئامۆژگاری

ئەی ئەو کەسەی کە دیلی هەواو ئارەزووی خۆتیت و ناتوانێت ڕزگارت بێت! ئەی بێ ئاگا لە مردن، ئەی لە خۆبایی بوو بە لەش ساغی، ئایا نازانیت لە بۆسەی مردندایت، بەم حاڵەوە بیر لە بەجێ هێشتنی دنیا بکەرەوە لەسەر ئەو بارودۆخەت، ئەگەر نەگریایت خۆت بگریێنە.

# تاوانی چل و چوار

## نەفرەتکار

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)[١]. واتە: قسە وتن بە موسڵمان فیسقە دەرچوونە لە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ شەر دژی موسڵمان) (کوفر کافربوون نیە، بەڵکو گەورەیی تاوانەکە دەردەخات).

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:(لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ )[٢].واتە: نەفرەت لە بڕوادار وەك کوشتنی وایە .

وە لە (صەحیحی) موسلیمدا هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : ( لَا يَكُونُ اللَّعَّانُونَ شُفَعَاءَ ولا شُهَدَاءَ يوم الْقِيَامَةِ)[٣]. واتە: نەفرین کەران نابن بە تکاکار و شاهید لە ڕۆژی دواییدا.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لَا يَنْبَغِي لِصِدِّيقٍ أَنْ يَكُونَ لَعَّانًا)[٤]. واتە: ڕاستگۆ نابێت نەفرین بکات.

بێگومان پێغەمبەری خواﷺ سزای ئەو کەسەی داوە کە نەفرەت لە حوشترەکەی دەکات، (عمران بن حصين) دەڵێت: پێغەمبەرﷺ لە هەندێ لە گەشتەکانیدا بوو، ئافرەتێك لە (الأنصار) لەسەر حوشترەکەی بوو، حوشترەکە بێزاری کرد، ئەویش نەفرەتی

١ - البخاري(٤٨)، ومسلم(٦٤).

٢ - البخاري(٦٠٤٧).

٣ - مسلم(٢٥٩٨).

٤ - مسلم(٢٥٩٧).

لیٚ کرد،پێغەمبەر ﷺ گوێی لیٚ بوو فەرمووی : (خُذُوا ما عليها وَدَعُوهَا فَإِنَّهَا مَلْعُونَةٌ )[1].
ئەو حوشترەی لیٚ وەربگرنەوە و بەرەلاّی بکەن چونکە ئەوە نەفرەتی لیٚ کراوە. ( عمران) دەڵێت: ئەو حوشترە لەناو خەڵکیدا دەهات و دەچوو کەس نزیکی نەدەکەوتەوە.

## بــــەش

دروستە بە گشتی نەفرەت کردن بەبیٚ دیاریکردن و تایبەت کردن.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ ( هود: ١٨ ). واتە: ئاگەدارین! نەفرەتی خوا لەسەر ستەمکارانە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾( آل عمران : ٦١). واتە: پاشان لەخوا بپاڕێینەوە و ئینجا داوا بکەین نەفرین و لەعنەتی خوا دابباریٚتە سەر درۆزنەکان.

لە (جابر) وە دەڵێت: ( لَعَنَ رسول اللّه صلى الله عليه وسلم آكِلَ الرِّبَا وموكله وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ، وقال: هُمْ سَوَاءٌ). واتە: پێغەمبەری خواﷺ نەفرەتی کردووە لە بخۆری ریبا و وەکیلەکەو شایەتەکەو نووسەرەکەش، وە فەرمووی: هەموویان وەك یەك وان.

هەروەها فەرموویەتی : ( لَعَنَ الله الْوَاصِلَةَ وَالْمُسْتَوْصِلَةَ وَالْوَاشِمَةَ وَالْمُسْتَوْشِمَةَ وَالنَّامِصَةَ وَالْمُتَنَمِّصَةَ). واتە:

(الواصلة) ئەو ئافرەتەیە قژ لەسەر قژی دادەنێت

(المستوصلة): ئەو ئافرەتەیە بۆی ئەنجام دەدات

(والنامصة): ئەو ئافرەتەیە مووی برۆکانی دەردەهێنێت.

---

[1] - مسلم(٢٥٩٥).

(والمتنمصة): ئەو ئافرەتەیە کە بۆی لادەبات.

هەروەها پێغەمبەرﷺ نەفرەتی کردووە لە (الصالقة والحالقة والشاقة).

(الصالقة): ئەو ئافرەتەیە لە کاتی بەڵاو موسیبەتدا دەنگی بەرز دەکاتەوە.

(والحالقة): ئەو ئافرەتەیە لەکاتی بەڵاو موسیبەتدا قژی دەبڕێت.

(والشاقة): ئەو ئافرەتەیە لەکاتی بەڵاو موسیبەتدا جل و بەرگ لەبەر خۆی دەدڕێت.

وەهەروەها نەفرەتی کردووە لەو کەسەی کە سنووری زەوی دەگۆڕێت[١].

وەنەفرەتی کردووە لەوکەسەی کە لە پێناو جگە لەخوادا قوربانی دەکات[٢].

وەنەفرەتی کردووە لە دز[٣].

وەنەفرەتی کردووە لەو پیاوەی وەك ئافرەت هەڵسوکەوت دەکات ، ئەو ئافرەتەش وەك پیاو هەڵسوکەوت دەکات.

هەروەها نەفرەتی کردووە لەو کەسەی بەرامبەر براکەی دەست دەدات بە ئاسن( ١ ).

وەنەفرەتی کردووە لەو کەسەی کە نێوچاوانی ئاژەڵ داخ دەکات( ١ ).

وەنەفرەتی کردووە لەو ئافرەتەی کە سەرجێی پیاوەکەی جێ دەهێڵێت هەتا دەگەڕێتەوە.

هەروەها نەفرەتی کردووە لە دەسەڵاتدارێك هەتا کە بەزەیی بە ژێردەستەکەیدا نایەتەوە.

---

[١] - مسلم(٢٩٧٨).

[٢] - مسلم(٢٩٧٨).

[٣] - البخاري(٦٧٩٩)، ومسلم(١٦٨٧).

# بــەش

# ئــامۆژگاری

بزانە نەفرەت كردن لە موسڵمان بەیەكدەنگی زانایان قەدەغەیە، بەڵام دروستە نەفرەت كردن لەو كەسانەی بەگشتی ئەو سیفەتانەیان تێدا هەیە، وەك: نەفرەتی خوا لە ستەمكاران، نەفرەتی خوا لە بێ باوەڕان، نەفرەتی خوا لەجولەكەو گاور، نەفرەتی خوا لە فاسیقەكان، نەفرەتی خوا لە وێنە گران (پەیكەری بت)، وەهاوشێوەی ئەمانەش.

بەڵام نەفرەت كردنی موسڵمانێك بەتاك ئەگەر تاوانبار كرابێت بەتاوانێك، وەك: جولەكە، یا گاور، یا زاڵم، یا داوێن پیس، یا دز، یا ڕیبا خۆر، فەرموودەكان لە ڕووكەش وادەر دەخەن كە ئەوە قەدەغە نیە. ئیمامی غەزالی ئاماژەی بەوە كردووە كە قەدەغەیە ئیللا بۆ كەسێك نەبێت كە بزانین ئەو كەسە لەسەر كوفرو بێباوەڕی مردووە. وەك (أبي لهب) و (أبي جهل) و (فرعون) و (هامان) و هاوشێوەكانی، دەڵێت: چونكە نەفرەت كردن بریتیە لە دوورخستنەوەی ئەو كەسە لە ڕەحمەتی خوا، نازانین ئەوكەسە لەسەر فاسیق بوون دەمرێت یا كافربوون.

ئەوەی كە نزیكە لە نەفرەت كردن دوعا كردنە لە كەسێك بە شەڕو خراپە لە كەسی زاڵم، وەك: خوا لەشی ساغت نەكات، هەروەها نەفرەت كردن لە ئاژەڵ و بێ گیانەكان ئەمانە هەمووی باش نییە.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەگەر كەسێك بەدەمیدا هات و نەفرەتی كرد لە كەسێك كەشایەنی ئەوە نیە، ئەوە با بڵێت مەگەر شایەنی ئەوە نەبێت.

## بەشێکی تر

درووستە بۆ ئەو کەسەی فەرمان بەچاکە دەکات و ڕێگری لە خراپە دەکات کاتێك کە قسە لەگەڵ کەسێك دەکات بڵێت:هاوار بۆ تۆ، یا ئەی لاواز، یا کورتبین ، یائەی ستەمکار لەخۆت یا هاوشێوەی ئەمانە، بە هیچ شێوەیەك نابێت بگاتە دەستەواژەی درۆکردن.

نابێت بە ئاشکرا بە شێوەیەك جنێو بدات یا تۆمەتباری بکات کە ئەو هەست بە خۆبەکەمزانی بکات،تەنانەت ئەگەر ئەو تۆمەتانەش ڕاست بێت، بەڵام دەبێت بەدانایی بێت، چونکە ئامانج لەوەدا تەمێکردن و دوورخستنەوەیە، وەدەبێت قسەکە کاریگەری هەبێت لەسەر ئەوکەسە.

## ئامۆژگاری

ئەی ئەو کەسەی توێشوی کەمت ئامادەکردووە و ڕێگەت دوورە! ئەی ئەو کەسەی ڕوودەکاتە خراپە، پشت دەکات لەوەی کە سوود و قازانجی بۆی هەیە، ئایا نازانی ئەو شتەی کە باشە لێت ون بووە! تا کەی زەمانە لە بیر دەکەیت و ئەویش کاتەکانت بۆ دەژمێرێت!

# تاوانی چل و پێنج

## ناپاکی و بەڵێن نەبردنە سەر

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ مَسْـُٔولًا ﴾الإسراء: ٣٤). واتە: بە وەفا بن بۆ بەڵێن و پەیمان، چونکە بەڕاستی بەرپرسیارن لە بەرامبەر بەڵێن و پەیمانەکانتان.

(الزجاج) دەڵێت: هەموو ئەوەی کەخوا فەرمانی پێ کردووە و ڕێگری لێکردووە ئەوە بەڵێنە.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ ۚ ﴾(المائدة: ١ ) .

(العقد) بریتیە لە شتانەی کە خوای گەورە فەرزی کردووە لەسەرمان، وە (مقاتل بن حیان)دەربارەی دەڵێت:﴿ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ ۚ ﴾واتە: مەبەست لەو بەڵێنەیە کە خوای گەورە لە قورئاندا داویەتی، ئەوەی کە فەرمانی پێ کردوون بە چاکەو ڕێگری لێ کردوون لە خراپە، وە هەروەها ئەو پەیمانەی کە لەنێوان ئێوەو بتپەرستەکاندا هەیە، و ئەوەی لەنێوان تاکەکانی خەڵکدا هەیە. والله أعلم.

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يوم الْقِيَامَةِ يُقَالُ هذه غَدْرَةُ فُلَانٍ)[١]. واتە: بۆ هەموو ستەمکارێك پەیداخێك هەیە لە ڕۆژی دواییدا، پێی دەوترێت ئەوە ناپاکی فلاَن کەسە.

لە (صەحیحی) بوخاریدا هاتووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : خوای گەورە دەفەرموێت: ( يقول الله تعالى : ثلاثة أنا خصمهم يوم القيامة: رجل أعطى بي ثم غدر، ورجل باع حرا فأكل

[١] – البخاري(٣١٨٨)، ومسلم(١٧٣٥).

ثمنه، ورجل استأجر أجيرا فاستوفى منه ولم يعطه أجره ).واته: سێ جۆر كەس هەن كە خۆم سكالأكارم لەسەريان لە ڕۆژی قیامەتدا: كەسێك كە پەنای كەسێك بدات لەبەر من ،پاشان خیانەت و ستەمی لێ بكات، بەڵێنی ئەمان بدات و نەیباتە سەر، هەروەها كەسێك كەسێكی ئازاد بكاتە بەندەی خۆی و بیفرۆشێت و نرخەكەشی بخوات، هەروەها كەسێك یەكێك بەكرێ بگرێت و ئیشەكەی خۆی پێ بكات و دوایی كرێكەی نەداتێ.

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ( من خَلَعَ يَدًا من طَاعَةٍ لَقِيَ اللَّهَ يوم الْقِيَامَةِ لَا حُجَّةَ له وَمَنْ مَاتَ وَلَيْسَ في عُنُقِهِ بَيْعَةٌ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً)[1]. واتە: هەركەسێك دەستبەرداری گوێڕایەڵی خەلیفەی موسڵمانان بێت دەگاتە لای خوای گەورە هیچ بەڵگەیەكی پێ نیە، وەهەركەسێك بمرێت، لەگەردنیدا بەیعەت نەبێت ئەوە بە مردنێكی نەفامانە دەمرێت.

پێغەمبەری نازدار ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُزَحْزَحَ عن النَّارِ وَيُدْخَلَ الْجَنَّةَ فَلْتَأْتِهِ مَنِيَّتُهُ وهو يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَأْتِ إلى الناس الذي يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إليه وَمَنْ بَايَعَ إِمَامًا فَأَعْطَاهُ صَفْقَةَ يَدِهِ وَثَمَرَةَ قَلْبِهِ فَلْيُطِعْهُ إن اسْتَطَاعَ فَإِنْ جاء آخَرُ يُنَازِعُهُ فَاضْرِبُوا عُنُقَ الْآخَرِ)[1]. واتە: هەركەس حەز دەكات دوور بخرێتەوە لە ئاگر و بچێتە بەهەشت ئەوە با لەكاتی مردندا بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی هەبێ، وە با بچیت بۆ لای خەڵكی چۆن حەز دەكات خەڵكی بچن بۆ لای ئەو، وە ئەوەی پەیمان بە پێشەوایەك دەدات و دەستی دەخاتە ناو دەستی و دڵی دەداتێ، ئەوە با گوێڕایەڵی بكات، ئەگەر كەسێكی تر هات بەربەرەكانی لەگەڵدا بكات بدەن لەگەردنی.

[1] – مسلم(١٨٥١).

[1] – مسلم(١٨٤٤).

# تاوانی چل و شەش

## بەڕاست دانانی جادووگەرو ئەستێرە ناس

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴾(الإسراء: ٣٦ ). واتە: ( ئەی مرۆڤ ) لەشتێك مەدوێ و شوێنی شتێك مەکەوە کە زانست و زانیاریت دەربارەی نیە، چونکە بەڕاستی کۆئەندامی بیستن و بینین و تێگەیشتن هەرهەمووی، بەرپرسیارە لە بەرامبەریەوە.

( الوابلي) لە (ابن عباس) وە دەڵێت: خوای گەورە پرسیار لە مرۆڤەکان دەکات لەوەی کە کردوویانە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە تەماشاکردنی نامەحەرەم قەدەغەکراوە، هەروەها گوێگرتن لەوەیشی کە درووست نیە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ٱرْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ ﴾( الجن ٢٦ - ٢٧). واتە: ئەو زاتە زانای نهێنی و شاراوەکانە، کەسیش لە نهێنی و شاراوەکانی ئاگادار ناکات. مەگەر بۆ پێغەمبەرێك خوا خۆی ڕازی بێت ( بەوەی هەندێ نهێنی بزانێت ).

(ابن الجوزی) دەڵێت: ﴿ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ ﴾ مەبەست خوای گەورەیە تاك و تەنهایە و هاوەڵی نیە لە موڵکیدا، ﴿ فَلَا يُظْهِرُ ﴾ واتە: کەس ناتوانێت لە نادیارەکانی بزانێت ئیللا مەگەر خۆی بە پێغەمبەرێکی وتبێت، چونکە یەکێك لە نیشانە ڕاستییەکانی پێغەمبەران هەواڵدانی هەندێ لە غەیب و نادیارەکانە.

واته: ئەوەی كه خوای گەورە هەڵیبژاردبوو بۆ پێغەمبەرایەتی هەندێ له غەیب و نادیاری پێ ئاشنا دەكات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كه هەركەس بڕوای وابێت كه ئەستێرەكان بەڵگەن لەسەر غەیب ئەوە كافرو بێباوەڕە.

پێغەمبەری خوای ﷺ فەرموویەتی: ( من أتى عَرَّافاً أو كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يقول فَقَدْ كَفَرَ مِمَّا أُنْزِلَ الله على مُحَمَّدٍ). واته: هەركەس بچێته لای جادووگەرێك،یا فاڵچیەك، بەڕاستی بزانێت لەوەی كه دەیڵێت، ئەوە بێ باوەڕ بووە بەرامبەر بەو پەیامەی كه دابەزیووە بۆ سەر ( محمد ).

له (زید)ی كوڕی (خالد)ی (الجهنی) ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:(هل تَدْرُونَ مَاذَا قال رَبُّكُمْ)؟ قالوا: الله وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قال: ( أَصْبَحَ من عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا من قال: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا من قال: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ)[1]. واته: ئایا دەزانن پەروەدگارتان چی دەڵێت؟ وتیان خواو پێغەمبەرەكەی دەزانن. فەرمووی: بەشێك له بەندەكانم بڕوادار بوو بەشێكی تریش بێ باوەڕ، بەڵام ئەوەی كه بڵێت: بەفەزڵ و ڕەحمەتی خوا باران باری ئەوە بڕواداره به من و بێ باوەڕە به ئەستێرەكان، وه ئەوەی كه بڵێت: بەهۆی ئەوەو ئەوەوە باریوە ئەوە بێ باوەڕ بووە به من و بڕوادار بووە به ئەستێرەكان.

زانایان دەڵێن: ئەگەر موسڵمانێك بڵێت: باران باری به ( نوء كذا) مەبەست له( نوء) ئەوەیە كه ئەو باران دەبارێنێت و باران دروست دەكات جگه له خوای گەورە، ئەوە كافر دەبێت و به هەڵگەراوە تەماشا دەكرێت.

بەڵام ئەگەر بڵێت: ئەوە نیشانەی باران بارینه لەكاتی ئەو نیشانەدا باران دەبارێت و بارینیشی هەر به ویستی خوای گەورەیە، ئەوە بێ باوەڕ نابێت، زانایان ڕاو بۆچوونی

---

[1] – البخاري(٨٤٦)، ومسلم(٧١).

جیاوازیان هەیە لەسەر بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە کە ئاساییە یا باش نیە، باشتر وایە بەکار نەهێنرێت، چونکە ئەو وتانە وتەی بێ باوەڕانە.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من أتى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عن شَيْءٍ لم تُقْبَلْ له صَلَاةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً)[1]. واتە: هەرکەس بچێتە لای جادووگەرێك و پرسیاری لێ بکات دەربارەی شتێك ئەوە چل شەو نوێژی لێ وەرناگیرێت.

لە (عائشة) وە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: (إِنَّ الْمَلَائِكَةَ تَنْزِلُ فِي الْعَنَانِ وهو السَّحَابُ فَتَذْكُرُ الْأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّمَاءِ فَتَسْتَرِقُ الشَّيَاطِينُ السَّمْعَ فَتَسْمَعُهُ فَتُوحِيهِ إلى الْكُهَّانِ فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِائَةَ كَذْبَةٍ من عِنْدِ أَنْفُسِهِمْ). واتە: فریشتەکان لە بەرزی یەوە لە نێو هەورەوە نازڵ دەبن و لەو فەرمانەی خوای گەورە دەدوێن کە لە ئاسماندا بڕیاری لەسەر داوە، جا شەیتانەکان گوێ هەڵدەخەن و ئەو باسە دەقۆزنەوە و نیگا بۆ ئەو کەسانە دەکەن کە گوایە لە نهێنی و شاراوەکان شارەزان، ئەوانیش سەد درۆی لە لایەن خۆیانەوە تێکەڵ دەکەن!!

## ئامۆژگاری

ئەی بەندەکانی خوا، بیر لە ڕابردووتان بکەنەوە پێش ئەوەی لەناو بچن، تەماشای کردارەکانتان بکەن پێش ئەوەی بخرێنە ناو گۆڕەکانتان، خۆتان سازو ئامادە بکەن بۆ بەجێهێشتن پێش ئەوەی بەزۆر پەلکێش بکرێن.

[1] – مسلم (٢٢٣٠).

# تـاوانی چل و حەوت

# یاخی بوونی ژن لە مێردەکەی

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴾(النساء: ٣٤). واتە: ئەو ئافرەتانەش ئێوە لێیان دەترسن سەرکەشی و سەرپێچی بکەن سەرەتا ئامۆژگاریان بکەن، ( ئەگەر سوودی نەبوو) لەناو جێدا پشتیان تێبکەن، ( ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو ) لێیان بدەن (بەمەرجێك لێدانەکە لە دەم و چاو نەبێت و ئاسەوار بەجێنەهێڵێت )، ئەگەر بەم هۆیانە لە لادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێ مەکەن و ڕێگەی تر مەگرنەبەر ( بۆ ئازاردانیان ) بێگومان خوا بەرزو بڵندو گەورەیە، ( ئەگەر ستەمیان لێبکەن تۆڵەتان لێدەسێنێت ).

(الواحدي) دەڵێت:( النشوز: واتە: سەرپێچی کردنی پیاو ئەویش ئەوەیە کە خۆی لەپیاوەکەی بەگەورەتر بزانێت.

﴿ فَعِظُوهُنَّ ﴾ بە قورئانی پیرۆز ئامۆژگاری بکە و ئەوەی کە ئەو فەرمانی پێ کردووە، ﴿ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ ﴾، (ابن عباس) دەڵێت: ئەوەیە کە لەسەرجێ پشتی تێ بکات و قسەی لەگەڵ نەکات، (الشعبي) و(مجاهد) دەڵێت: سەرجێی چۆڵ بکە لە گەڵیدا مەخەوە، ﴿ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ ﴾ واتە: لێدانێك کە بریندارى ئازاری نەدات بۆنموونە بەدار سیواك .

(ابن عباس) دەڵێت: لیدانەکە بۆ تەمێ کردن بێت، وەك مشتە کۆڵەی بێ ئازاردان، پێویستە پیاو خۆی بپارێزێت لە یاخی بوونی ژنەکەی بەوەی کە خوای گەورە فەرمانی پێ

کردووە لەم دەقەدا﴿ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ ﴾ ئەگەر گوێڕایەڵیتان بکەن لەوەی کە پەیوەندی بە ئەوانەوە هەیە، ﴿ فَلَا تَبْغُواْ ﴾ لەخۆتانەوە تاوانباریان مەکەن.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( إذا دعَا الرَّجلُ امْرَأتَهُ إلى فِرَاشِهِ فلم تَأْتِه فَبَاتَ غَضْبَانَ عليها لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حتى تُصْبِحَ). واتە: ئەگەر پیاو بانگی خێزانەکەی بکات بۆ سەرجێیی و بەدەمیەوە نەهات ئەوە فریشتەکان نەفرەتی لیٚ دەکەن هەتا ڕۆژ دەبێتەوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ هَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حتى تَرْجِعَ)[1]. واتە: ئەگەر ئافرەت شەو بکاتەوە سەرجێیی پیاوەکەی بەجێهێشتبیٚ، فریشتەکان نەفرەتی لیٚ دەکەن هەتا دەگەڕێتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (لَا يَحِلُّ لِلْمَرْأَةِ أَنْ تَصُومَ وَزَوْجُهَا شَاهِدٌ إلا بِإِذْنِه، ولا تَأْذَنَ في بَيْتِهِ إلا بِإِذْنِه)[2]. واتە: دروست نیە بۆ ئافرەت ڕۆژوو (سونەت) بگرێت و پیاوەکەی حازر بێت ئیللا بە پرسی ئەو نەبێت، نابێت کەس بهێنێتە ماڵەوە ئیللا بە پرسی پیاوەکەی نەبێت.

پێویستە لەسەر ژن ڕەزامەندی پیاوەکەی بەدەست بهێنێت و خۆی دوور بگرێت لەوەی کە ئازاری بدات، هەرکات داوای سەرجێیی لیٚ کرد دەبێت بە دەمیەوە بچێت، لەبەر فەرموودەی پێغەمبەرﷺ : (إذا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ فَلْتَأْتِهِ وَإِنْ كانت على التَّنُّورِ)[3].واتە: ئەگەر پیاوێك بانگی ژنەکەی بکات بۆ پێویستیەك با بە دمیەوە بچێت ئەگەر لەسەر تەنوریش بێت.

زانایان دەفەرموون: مەگەر بیانوویەکی هەبێت وەك سووڕی مانگانە( حیض) یا خوێنی دوای منداڵ بوون ( النفاس ) ئەوە دروست نیە بەدەمیەوە بچێت، بەهەمان شێوە بۆ

[1] – مسلم(١٤٣٦).

[2] – البخاري(٥١٩٥).

[3] – الترمذي(١١٦٠)، وصححه الشيخ الألباني.

پیاویش دروست نیە داوای ئەوە بكات لە كاتی سووڕی مانگانەو خوێنی دوای مندالّ بوون و نابێت لەگەلّیدا جووت بێت ئیللا دوای پاك بوونەوە نەبێت، چونكە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ﴾(البقرة: ٢٢٢).
واتە: خۆتان بەدوور بگرن لە هاوسەرەكانتان كە لە حالّەتی ( عادەی مانگانەدا بوون ) نزیكیان مەكەون تا پاك دەبنەوە .

پێویستە ئافرەت هەست بەوە بكات كە لە ژێر دەستی پیاوەكەیدایە، بۆی نیە بە ئارەزووی خۆی هەلّسوكەوت بە مالّەكەی بكات ئیللا بە پرسی ئەو نەبێ، هەولّ بدات مافی پێش بخات بەسەر مافەكانی خۆیەوە، مافی خزمەكانی بەسەر مافی خزمەكانی خۆیەوە،دەبێت ئامادە بێت بەردەوام گرنگی بدات بە لایەنی پاك و خاوێنی و شانازی نەكات بە جوانیەوە، برینداری نەكات بە وتەی ناشرین ئەگەر كەم و كورییەكی تێدا بەدی كرد.

بەهەمان شێوە پێویستە لەسەر ئافرەت شەرم لە پیاوەكەی بكات و گوێڕایەلّی لە فەرمانەكانی بكات، لەكاتی قسەكردندا لە ئاستیدا بێدەنگ بێت، لە كاتی هاتنەوەی بۆ مالّەوە لەبەری هەستێت، دوور بكەوێتەوە لە هەموو ئەوانەی كە تووڕەی دەكات، لە كاتی دەرچوونیدا لە گەلّیدا هەستێت، لەكاتی خەودا خۆی جوان و بۆن خۆش بكات، بەهەموو شێوەیەك دووربكەوێتەوە لە ناپاكی كردن لە سەرجێیی بێت یا لە مالّەكەی، وە بەردەوام خۆی بۆن خۆش بكات، گرنگی بدات بە پاكی دەم و ددانی بە سیواك و بە بۆنی خۆش، بەنهێنی باسی نەكات و، رێز لە كەسوكاری بگرێت، ئەوەی كەمە ئەو بەزۆری بزانێت.

## بــەش

### فەزلّ و چاكەی ئەو ئافرەتەی كە گوێڕایەلّی پیاوەكەی دەكات، وە قورسی سزای ئەو ئافرەتەی كە سەرپێچی پیاوەكەی دەكات

پێویستە لەسەر ئەو ئافرەتەی كە لە خوا دەترسێت كۆشش بكات بۆ گوێڕایەلّی خوای گەورە و پاشان گوێڕایەلّی پیاوەكەی، هەولّ بدات پیاوەكەی لە خۆی ڕازی بكات، چونكە

ئەو بەهەشت و دۆزەخێتی، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (اطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ)[٤]. واتە: دۆزەخم پێنیشان درا بینیم زۆربەی خەڵکەکەی ئافرەتانن.

ئەمەش بەهۆی گوێڕایەڵی نەکردنی خواو پێغەمبەرەکەی و پیاوەکانیانە و زۆری خۆ دەرخستنیانە، (التبرج) خۆدەرخستن ئەوەیە کە کاتێك بیەوێت دەربچێت جوانترین پۆشاك لەبەر بکات و خۆی جوان بکات، خەڵکیش بەهۆی ئەوەوە تووشی فیتنەو کارەساتە بن، خۆ ئەگەر ئەو بۆ خۆی ئاسایی بێت بۆ خەڵك ئاسایی نیە !.

بەهەمان شێوە پێویستە لەسەر پیاو خۆی بپارێزێت، بە هەمان شێوەش بۆ ئافرەتان دەبێت خۆیان بپارێزن، ئەگەر ناچار بو، دەربچێت بۆ سەردانی ماڵی باوکی یا خزم و کەس و کاری یا بۆ حەمام و هاوشێوەی ئەمانە کە ناچارە هەر بڕوات، با بە پرسی پیاوەکەی دەربچێت و خۆ دەرنەخات و نەبێتە مایەی فیتنە.

لە کاتی ڕێکردندا چاوی بپارێزێت، تەماشای بەر پێی خۆی بکات نەك بەڕاست و چەپدا تەماشا بکات، ئەگەر ئەمەی ئەنجام نەدا ئەوە سەرپێچی کردووە.

لە (معاذ)ی کوڕی (جبل) وە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لَا تُؤْذِي امْرَأَةٌ زَوْجَهَا فِي الدُّنْيَا إلا قالت زَوْجَتُهُ من الْحُورِ الْعِينِ لَا تُؤْذِيهِ قَاتَلَكِ الله فَإِنَّمَا هو عِنْدَكَ دَخِيلٌ يُوشِكُ أَنْ يُفَارِقَكِ إِلَيْنَا)[٣]. واتە: هیچ ئافرەتێك ئازاری پیاوەکەی نادات لە دنیادا، ئیللا لەو حۆریانەی بەهەشت بەژنەکەی دەڵێن: ئازاری مەدە خوا بتکوژێت بێگومان ئەو لای تۆ میوانە لەوەیە تۆ جێبهێڵێت و بێت بۆ لای ئێمە.

---

[٤] – البخاري(٥١٩٨)، ومسلم(٢٧٣٨).

[٣] – الترمذي(١١٧٤)، وابن ماجه(٢٠١٤)، وصححه الشيخ الألباني.

## بەشێکی تر

ئەگەر ئافرەت فەرمانی پێکراوە گوێڕایەڵی پیاوەکەی بکات و بەهەمان شێوەش پیاو فەرمانی پێکراوە نەرم و نیان و بەخشندە بێت لە گەڵیاندا، ئارام بگرێت لە کەم و کوڕییەکانیان ، بەتەواوی پێویستییە ئابورییەکانیان جێبەجێ بکات و بە خووڕەوشتی جوان مامەڵەیان لەگەڵ بکات، وەك چۆن خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ ﴾( النساء: ١٩). واتە: بێگومان پێغەمبەری خواﷺ زۆر نەرم و نیان بووە بەرامبەر ئافرەتان.

# تاوانی چل و هەشت

## وێنە لە سەر جل و بەرگ و دیوار و بەرد و پارەو هەموو شتەکانی تر، یەکسانە ئەگەر لە مۆم بێت یا هەویر یا ئاسن یا مس یا خوری یا هەرشتێکی تر، فەرمان ئەوەیە کە لاببرێت

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾( الأحزاب: ٥٧). واتە: بێگومان ئەوانەی ئازاری خواو پێغەمبەرەکەی دەدەن(مەبەست ئازاردانی پێغەمبەرەﷺ یان ئەوانەی کە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن و کوفر دەکەن و جنێوی پێدەدەن) خوا نەفرینی لێ کردوون لە دنیاو قیامەتدا سزایەکی زۆر خەجاڵەت و سەرشۆڕکەریشی بۆ ئامادە کردوون.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ أَصْحَابَ هذه الصُّوَرِ يُعَذَّبُونَ يوم الْقِيَامَةِ وَيُقَالُ لهم: أَحْيُوا ما خَلَقْتُمْ)[1]. واتە: بەڕاستی خاوەنی ئەم پەیکەرانە سزا دەدرێن لە ڕۆژی دواییداو پێیان دەوترێت: ئەوەی کە دروستتان کردووە ڕۆح بکەن بە بەریدا.

لە (عائشة) وە دەڵێت: قَدِمَ رسول اللَّهِ صلى الله عليه وسلم من سَفَرٍ وقد سَتَرْتُ بِقِرَامٍ لي على سَهْوَةٍ لي فيها تَمَاثِيلُ فلما رَآهُ رسول اللَّهِ صلى الله عليه وسلم هَتَكَهُ وقال: أَشَدُّ الناس عَذَابًا يوم الْقِيَامَةِ الَّذِينَ يُضَاهُونَ بِخَلْقِ اللَّهِ قالت: فَجَعَلْنَاهُ وِسَادَةً أو وِسَادَتَيْنِ)([2]). واتە: پێغەمبەری خوا لە گەشتێك گەڕایەوە منیش پەردەیەکەم دابوو بە پەنجەرەکەدا وینەو پەیکەری تێدا بوو کاتێك کە پێغەمبەر بینی لای برد و فەرمووی: : بەڕاستی ئەوانەی ئەم وێنانە دروست دەکەن لە پاشە ڕۆژدا سزا دەدرێن پێیان دەگوترێت: ئا دەی ئەوانە زیندوو بکەنەوە. وتی: دوایی کردمان بە بەرگە سەرینێك یا دوو بەرگە سەرین.

---

[1] – البخاري( ٥٩٥١)، ومسلم(٢١٠٨).

[2] – البخاري( ٥٩٥٤)، ومسلم(٢١٠٧).

لە(ابن عباس) وە دەڵێت: لە پێغەمبەرﷺم بیست دەیفەرموو: ( كُلُّ مُصَوِّرٍ فِي النَّارِ يَجْعَلُ له بِكُلِّ صُورَةٍ صَوَّرَهَا نَفْسًا فَتُعَذِّبُهُ فِي جَهَنَّمَ)[٢]. واتە: هەموو وینەگرێك(درووستکەری بت) لە دۆزەخدایە هەر وێنەیەك کە کێشاویەتی دەبیٚ بە گیانێك و سزای دەدات لە دۆزەخدا.

لە(ابن عباس) وە دەڵێت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: (من صَوَّرَ صُورَةً في الدُّنْيَا كُلِّفَ أنْ يَنْفُخَ فيها الرُّوحَ يوم الْقِيَامَةِ وَلَيْسَ بِنَافِخٍ أبداً)[٢]. واتە: هەرکەس پەیکەرێك دروست بکات لە دونیادا داوای لیٚ دەکرێت ڕووح بکات بە بەریدا لە ڕۆژی دواییدا، وەبەهیچ شێوەیەك ناتوانێت.

(أبو هريرة) دەڵێت: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: خوای گەورە دەفەرموێت: (وَمَنْ أظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا حَبَّةً وَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً)[٣]. واتە: کیٚ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی دەچیٚ شتیٚ درووست دەکا وەکو ئەوەی من درووستم کردووە؟ دەبا دەنکە دانەوێڵەیەك دروست بکات، یا گەردیلەیەك دروست بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فيه كَلْبٌ ولا صُورَةٌ)[٤]. واتە: فریشتەکان ناچنە ماڵێکەوە سەگ و، وێنە(پەیکەر)ی تێدا بێت.

ئەمە ئەگەر سەگ بەخێو بکات بەمەبەستی کشتوکاڵی و ڕاوکردن نەبێت، بەڵام ئەگەر ناچار بوو بەخێوی بکات بۆ پاسەوانی ماڵەکەی، ئەوە ئاسایی یە و هیچ گرفتێکی تیدا نیە.

---

[٢] - البخاري( ٢٢٢٥)، ومسلم(٢١١٠).

[٢] - البخاري( ٧٠٤٢)، ومسلم(٢١٠٦).

[٣] - البخاري( ٥٩٥٣)، ومسلم(٢١١١).

[٤] - مسلم(٩٦٩).

بەلاّم وێنە هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە ڕۆح لەبەرن، یەکسانە ئەگەر وێنەی ئاسایی بێت یا هەلْکۆلْراو یا لە جل و بەرگدا نەخش کرابوو یا هەرشێویەکی تر چونکە فەرموودەکە بەگشتی هێناویەتی، با خۆی بەدوور بگرێت.

لە(حیان)ی کوڕی (حصین) وە دەلێت: (علي )ی کوڕی( أبي طالب) ڕەزای خوای لێبێت پێی وتم: ئایا فەرمانت پیّ بکەم بەوەی کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی پیّ کردووم ؟ هەر پەیکەری بتێکت بینی بیشکێنە و، هەر قەبرێك کە بەرز بوو ڕێکی ئەرزەکەی بکەرەوە.

# تاوانی چل و نۆ

## لێدان و شیومن و درِینی جل و بەرگ و تاشینی قژ و هەڵکەندنی و نزا کردن بە داد وهاوار لە کاتی بەلاّو موسیبەتدا

(عبد الله )ی کورِی ( مسعود ) دەلێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( ليس مِنَّا من لَطَمَ الْخُدُودَ وَشَقَّ الْجُيُوبَ وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ ). واتە: لە ئێمە نیە کەسێك بە رِوومەتیا بکێشی و یەخەی خۆی دادرِێ وشین و شەپۆرِ و هات و هاواری سەردەمی نەفامی بکات.

(أم عطية) دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی لێ وەرگرتین لە بەیعەتدا کە هات و هاوار بەسەر مردوودا نەکەین.

لە ( نعمان )ی کورِی ( بشیر)وە دەڵێت: (عبد الله)ی کورِی ( رواحة) لە هۆش خۆی چوو، لەو کاتەدا خوشکەکەی هاواری دەکرد بەسەریدا دەیوت: وابراکەم، وا براکەم، کاتێك کە بەخەبەر هاتەوە فەرمووی: هەرچیت وت ئیللا پێم وترا تۆ وایت و تۆ وایت[٢].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عليه ). واتە: مردوو لەناو گۆرِدا ئازاری پی دەگات بەوەی کە هات و هاوای بەسەرەوە دەکەن.

هەروەها فەرموویەتی: (النَّائِحَةُ إذا لم تَتُبْ قبل مَوْتِهَا تُقَامُ يوم الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ من قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ من جَرَبٍ)[١]. واتە: ئەوەی کە هات و هاوار دەکات بەسەر مردوودا ئەگەر داوای لێخۆشبوون نەکات پێش مردنی لە رِۆژی دواییدا زیندوو دەکرێتەوە ، کراسێکی لە قەتران و زرێ یەکی لەبەردایە بەنەخۆشی پیستە(گرِوو) هەموو لەشی دادەپۆشێ.

---

[٢] – البخاري(٤٢٦٧).

[١] – مسلم(٩٣٤).

لە(الأوزاعي) وە دەڵێت: (عمر)ی كوڕی( الخطاب) – ڕەزای خوای لێبێت – گوێی لە دەنگی گریان بوو،چەند هاوەڵانێكی لە گەڵدا بوو، ڕووی تێیان كرد و تەمەشای كرد ئافرەتێك هات و هاوار دەكات دەستی بەرز كردەوەو لێی دا هەتا سەرپۆشەكەی كەوتە خوارەوە، فەرمووی: لێی دەدەم چونكە هات و هاوار دەكات و هیچ حورمەتێكی نیە، ئەوە لەبەر ئێوە بۆی ناگری، بەڵكو فرمیسك دەرێژێت بۆ سەروەت و سامانەكەتان، ئا ئەوە مردووەكانتان سزا دەدات لە گۆڕەكانیاندا، وە زیندووەكانیشتان لەماڵەكانی خۆیاندا، چونكە ئارامگرتنتان لێ قەدەغە دەكات كە خوا فەرمانی پێ كردووە، تووشی نا ئارامیتان دەكات كە خوای گەورە قەدەغەی كردووە.

زانایان دەفەرموون: قەدەغەیە دەنگ بەرز كردنەوە لە كاتی گریاندا، بەڵام گریان لەسەر مردوو بەبێ هاوار وفیغان قەدەغە نیە.

لە (عبد الله)ی كوڕی (عمر) – ڕەزای خوای لێبێت- دەڵێت: اشْتَكَى سَعْدُ بن عُبَادَةَ شَكْوَى له فَأَتَاهُ النبي صلى الله عليه وسلم يَعُودُهُ مع عبد الرحمن بن عَوْفٍ وَسَعْدِ بن أبي وَقَّاصٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بن مَسْعُودٍ رضي الله عَنْهُمْ فلما دخل عليه فَوَجَدَهُ في غَاشِيَةِ أَهْلِه فقال قد قَضَى قالوا لَا يا رَسُولَ اللَّهِ فَبَكَى النبي صلى الله عليه وسلم فلما رَأَى الْقَوْمُ بُكَاءَ النبي صلى الله عليه وسلم بَكَوْا فقال ألا تَسْمَعُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ ولا بِحُزْنِ الْقَلْبِ وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بهذا وَأَشَارَ إلى لِسَانِهِ أو يَرْحَمُ وَإِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِه عليه.
واتە: (سعد)ی كوڕی (عبادة) نەخۆش كەوت پێغەمبەریش ﷺ هات بۆ سەردانی. لەگەڵ (عبد الرحمن)ی كوڕی (عوف) و (سعد)ی كوڕی (أبو وقاص) – ڕەزای خوایان لێبێت- و(عبد الله)ی كوڕی (مسعود) كاتێ چووە ژوورەوە بۆ لای بینی وا لە ناو كۆمەڵێك لە كەس و كاریدا دەوریان داوە. فەرمووی: (چی یە تەواوبوو) وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا. ئیتر پێغەمبەر دەستی كرد بە گریان. كاتێ خەڵكی گریان پێغەمبەری خوایان بینی ﷺ ئەوانیش دەستیان كرد بە گریان. فەرمووی: (ئەرێ گوێ ناگرن) لە ڕاستیدا خوا بە فرمێسكی چاو سزای هیچ كەسێك نادات هەروەها بە خەفەت و بێتاقەتی دڵ، بەڵكو سزا

ئەدات بەمە- ئاماژەی بۆ زمانی کرد- یا خود ڕەحمیش ئەکات. بێگومان مردوو بە گریانی کەس و کاری ئازاری پێ دەگات.

لە( أسامة بن زيد ) ەوە دەڵێت:(أَرْسَلَتْ ابْنَةُ النبي صلى الله عليه وسلم إليه إِنَّ ابْنًا لي قُبِضَ فائتنا فَأَرْسَلَ يقرىء السَّلَامَ وَيَقُولُ إِنَّ لِلَّهِ ما أَخَذَ وَلَهُ ما أَعْطَى وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ فَأَرْسَلَتْ إليه تُقْسِمُ عليه لَيَأْتِيَنَّهَا فَقَامَ وَمَعَهُ سَعْدُ بن عُبَادَةَ وَمَعَاذُ بن جَبَلٍ وَأُبَيُّ بن كَعْبٍ وَزَيْدُ بن ثَابِتٍ وَرِجَالٌ فَرُفِعَ إلى رسول اللَّهِ صلى الله عليه وسلم الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ قال حَسِبْتُهُ أَنَّهُ قال كَأَنَّهَا شَنٌّ فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ فقال سَعْدٌ يا رَسُولَ اللَّهِ ما هذا فقال هذه رَحْمَةٌ جَعَلَهَا الله في قُلُوبِ عِبَادِهِ وَإِنَّمَا يَرْحَمُ الله من عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ)[٢]. واتە: کچەکەی پێغەمبەر ﷺ کوڕێکی مردبوو، ناردی بە دوایدا با بێت بۆ لامان. پێغەمبەریش ﷺ زەلامێکی نارد کە سەلامی پێ بگەیەنێت و پێ ی بڵێت: خوا چی بوێت هی خۆیەتی و چیشی وەرگرتەوە هەر هی خۆیەتی هەموو کەس لای خوا ئاکام و ئەجەلێکی دیاری کراوی هەیە، پێی بڵێ با ئارام بگرێت و بەتەمای پاداشتی خوا بێت ) بەڵام کچەکەی ناردی بەدوایدا و سوێندی خواردووە هەر دەبێت بێت بۆ سەردانی.

ئیدی پێغەمبەر هەستاو (سعد)ی کوڕی (عبادة) و (معاذ)ی کوڕی جبل) و (ابي )ی کوڕی کعب) و (زيد)ی کوڕی ثابت) وە چەند پیاوێکی تریش لەخزمەتیدا هەستان منداڵەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەناسە سوار بوو خڕەی سنگی دەهات چاوەکانی فرمێسکی لێ هاتەخوارەوە، (سعد) وتی: ئەمە چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەمە ڕەحم و بەزەییە کە خوای گەورە خستوویەتییە نێو دڵی بەندەکانیەوە، بێگومان خوا لە نێو بەندەکانیدا تەنها بەزەیی بەوانەیاندا دێتەوە کە بەڕەحم و میهرەبانن.

(أنس) دەڵێت: (دَخَلْنَا مع رسول اللَّهِ صلى الله عليه وسلم على أبي سَيْفٍ الْقَيْنِ وكان ظِئْرًا لِإِبْرَاهِيمَ عليه السَّلَام فَأَخَذَ رسول اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إبراهيم فَقَبَّلَهُ

---

[٢] – البخاري(١٢٨٤)، ومسلم(٩٢٣).

وَشَمَّهُ ثُمَّ دَخَلْنَا عليه بَعْدَ ذلك وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ فَجَعَلَتْ عَيْنَا رسول اللَّهِ صلى الله عليه وسلم تَذْرِفَانِ فقال له عبد الرحمن بن عَوْفٍ رضي الله عنه وَأَنْتَ يا رَسُولَ اللَّهِ فقال يا بن عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى فقال صلى الله عليه وسلم إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ ولا نَقُولُ إلا ما يَرْضَى رَبُّنَا وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ)[١]. واتە: لە خزمەتی پێغەمبەرﷺ دا چووین بۆ لای (أبو سیف)ی ئاسنگەر کە مێردی دایەنەکەی (إبراهیم)ی کوڕی پێغەمبەرﷺ بوو. پێغەمبەری خوا (إبراهیم)ی هەڵگرت و ماچی کردوو بۆنی کرد.لە پاشان دوای ئەوە جارێکی تر چووینەوە بۆ لای و بینیمان (إبراهیم) هەناسەی دێت و دەچێت و لە گیاندانایە، ئیتر پێغەمبەرﷺ چاوەکانی فرمیسکیان لێ هاتەخوارەوە (عبد الرحمن)ی کوڕی (عوف) – ڕەزای خوای لێبێ- وتی: تۆیش ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (ئەی کوڕی عەوف ئەمە ڕەحم و بەزەیی یە) لە پاشان فەرمووی: (بەڕاستی چاو فرمیسك ئەڕێژێت و دڵ خەمبار دەبێت و هەر ئەوەش ئەڵێین: کە پەروەردگارمان پێی رازیی یە، بەڕاستی ئەی (إبراهیم) ئێمە بە کۆچی تۆ خەمبارین.

بەلاّم فەرمووده (صەحیحەکان) کە هاتوون دەربارەی: (وَإِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عليه)[١]. واتە: بێگومان مردوو بە گریانی کەس و کاری سزا ئەدرێت. ئەمە لەسەر ڕووی دەرەوەی فەرموودەکە نیە بەڵکو لێکدانەوەی بۆ کراوە.

زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لە لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیە لەسەر چەند وتەیەك دیارترینیان: بەو مانایەیە کە کەسی مردوو هۆکاربێ لەو گریانەدا، یا پێشتر وەسیەتی کردبێ کە بۆی بگرین یا هاوشێوەی ئەوانە.

[١] – البخاري(١٣٠٣)، ومسلم(٢٣١٥).

[١] - البخاري(١٣٠٣)، ومسلم(٢٣١٥).

ئیمامی شافعی و هاوەڵانی پێیان وایە : كە باش نیە دوای مردن بۆ مردوو بگریت، گریانیش حەرام نیە وە دروستە پێش مردن و دوای مردن بۆی بگریت، بەلاَم باشتر وایە پێش مردن بۆی بگریت.

## بـــەش

ئایا بۆچی ئەو كەسەی هات وهاوار دەكات ئەو نەفرەت و سزا سەختەی بۆ دیاری كراوە؟ لەبەر ئەوەیە مرۆڤ تووشی نائارامی دەكات و بەرگری لێدەكات لە ئارام گرتن، لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە و پێغەمبەرەكەی فەرمانیان كردووە بە ئارام گرتن و رێگریان كردووە لە نائارامی و تورەبوون، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾(البقرة:١٥٣). واتە: ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە داوای كۆمەك و یارمەتی لە خوا بكەن بەهۆی ئارامگرتن و نوێژ كردنەوە، دڵنیابن كە خوا یارو یاوەری خۆڕاگرو ئارامگرانە.

لە (عائشة) وە ڕەزای خودای لێ بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : (ما من مُصيبَةٍ يُصَابُ بها الْمُسْلِمُ إلا كُفِّرَ بها عنه حتى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا)[١]. واتە :( هیچ موسیبەتێك نیە كە تووشی موسڵمان ببێ ،ئیلا ئەو موسیبەتە دەبێتە كەفارەتی گوناهەكانی، تەنانەت ئەگەر دڕكێكیش بچەقێ بە لەشیدا ) .

### بەشێك دەربارەی پرسە (التعزية)

ڕەحمەتی خوات لێبێت باش بزانە كە لە ڕاستیدا پرسە بریتییە لە ئارام گرتن، باسكردنی شتێك كە خاوەن مردووەكە گوێت لێبگرێ خەم وپەژارەی بڕەوێتەوە و بەلاَو موسیبەتەكەی لە لا سووك بكرێت، ئەمە كارێكی باشە چونكە بە گشتی فەرمان كردنە بە چاكەو دووركەوتنەوەیە لە خراپە وە لە چوارچێوەی ئەم دەقەدا كۆ دەبێتەوە كە خوای

١ – مسلم(٢٥٧٢).

گەورە دەفەرموێت:﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ﴾(المائدة: ٢). ئەمە باشترین بەڵگەیە دەربارەی پرسە.

باش بزانە بەڕاستی پرسە بریتیە لە فەرمان کردن بە ئارام گرتن، ئاساییە پێش ناشتن و دوای ناشتن، هاوەڵانی ئیمامی شافعی دەڵێن : پرسە لەو کاتە دەست پێدەکات کە مردووەکە دەمرێت و دەنێژرێت هەتا ماوەی سێ ڕۆژ، هاوەڵانی ئێمەش دەڵێن باش نیە پرسە دوای سێ ڕۆژ، چونکە پرسە دڵی خاوەن مردوو ئارام دەکات، بە شێوەیەکی گشتی دوای سێ ڕۆژ خاوەن پرسە دڵی بەرەو ئارام بوون دەچێت، بۆیە باشتر وایە دووبارە نەخرێتەوە بیری .ئەمەش بۆچوونی زۆربەی زانایانی مەزهەبی ئێمەیە .

باش نیە دانیشتن لە پرسەدا، واتە ماڵی مردووەکە لە ماڵی کەسێکدا کۆ ببنەوە بەمەبەستی پرسە، بێگومان باشترین پرسە ئەوەیە کە لە (اسامة)ی کوڕی ( زید ) وە دەڵێت : یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر ﷺ بانگهێشتی پێغەمبەری خوای کرد کە منداڵێکی کۆچی کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : وَيَقُولُ إِنَّ لِلَّهِ ما أَخَذَ وَلَهُ ما أَعْطَى وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ ) [٢]. واتە: ئەوەی خوا بردی هی خۆیەتی و چیشی وەرگرتەوە هەر هی خۆیەتی هەموو شتێکیش لای خوا ئاکام و ئەجەلێکی دیاری کراوی هەیە، پێی بڵێ با ئارام بگرێت و بەتەمای پاداشتی خوا بێت.

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت ئەم فەرموودەیە لە گەورەترین بنەماکانی ئیسلامە کە شتی زۆر گرنگ دەگرێتەوە لە بنەماکانی ئاین ولقەکانی و ئاداب و ئارامگرتن لە سەر موسیبەتەکان بە گشتی و خەم وپەژارەو نەخۆشی، جگە لەوانەش چەندین شتی تر .

لە ( ابو هريرة ) ەوە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەرچوو بۆ گۆڕستانی بەقیع، ئافرەتێکی بینی لەسەر گۆڕێك دەگریا، فەرمووی: (اتَّقِي اللّهَ وَاصْبِرِي) واتە: لە خوا بترسە و ئارام بگرە؟ وتی: ئەی بەندەی خوا ئەگەر تۆش تووشی بەلا ببوایەی ڕێگریت نەدەکردم!

---

[٢] – البخاري(١٢٨٤)، ومسلم(٩٢٣).

فەرمووی: (اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي) واتە: لە خوا بترسە و ئارام بگرە؟ وتی: ئەی بەندەی خوا گوێم لێتە وازم لێ بهێنە. پێغەمبەری خواش ﷺ لێی دوورکەوتەوە، پیاوێکی موسڵمان ئەمەی بینی هات بۆ لای ژنەکە وتی: ئەو پیاوە چی پێت وتی؟ ئەویش ئەوەی ڕوویدا بۆی باس کرد، پیاوەکە وتی: ئایا دەیناسیت؟ وتی: نە بەخوا؟ وتی: وای بۆ تۆ! ئەوە پێغەمبەری خوا بوو. ئافرەتەکە بە پەلە ڕۆشت هەتا گەیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئارام دەگرم، فەرمووی: (إنما الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى)[1]. واتە: ئارامگرتن لە کۆست کەوتنی یەکەمدایە.

لە (صەحیحی) موسلیمدا هاتووە: کوڕێکی (أبو طلحة) کۆچی کرد کە لە (أم سليم) بوو، بەمنداڵەکانی وت: ئەم هەواڵە لای باوکتان باس مەکەن هەتا خۆم بۆی باس دەکەم، (أبو طلحة) هاتەوە خێزانەکەی وەك ڕۆژەکانی تر چێشتی بۆی دانا و ئەویش لەسەر خۆ نانی خوارد، پاشان کاری سەر جێگەیان بۆکرد، کاتێك خیزانی بینی پیاوەکەی نانی خوارد و ئیسراحەتی کرد، وتی: ئەی (أبو طلحة) ئەگەر کەسانێك ئەسپەردەیەکی لە لای ماڵێکەوە هەبێت ئەگەر داوای بکەن دەتوانی بڵێیت نایدەمەوە؟ وتی: نەخێر، ((أم سليم)) وتی: دە وابزانە ئەوە کوڕەکەی تۆیە.وتی: ((أبو طلحة)) تووڕەبوو، وتی: وازت لێم هێنا هەتا غوسلم کەوتەسەر ، ئینجا هەواڵی مردنی کوڕمت پێ دا، ناتوانیت زاڵم بکەیت بەسەر ئارامگرتندا، لەماڵ دەرچوو هەتا گەیشتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا بەوەی کە ڕووی داوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای گەورە ئەو شەوەتان لێ پیرۆز بکات!. هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (ما أُعْطِيَ أحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ من الصَّبْرِ)[2]. واتە: هیچ بەخششێك بە کەس نەبەخشراوە باشتر بێت لە ئارامگرتن.

هەواڵ درا بە ئیمامی شافعی کە (عبد الرحمن)ی کوڕی ( مهدي) منداڵیکی کۆچی دوایی کردووە، زۆر خەمبار و بێتاقەت بووە، ئیمام شافعی نامەیەکی بۆ نارد دەڵێت:

---

[1] – البخاري(١٢٥٢)، ومسلم(٦٢٦).

[2] – البخاري(١٤٧٠).

براکەم سەرەخۆشی لە خۆت بکە چۆن سەرەخۆشی لە خەڵك دەکەیت، ئەوەی حەز ناکەیت خەڵك بیکات خۆتیش مەیکە، بزانە موسیبەت کۆتایی دێت بەڵام دوای ئەوە یان دەبێت بەخاوەن چاکە یا خراپە، کەواتە هەوڵ بدە لە پاداشتدا بەشت هەبێت، لە موسیبەتەدا خوای گەورە ئارامی ببەخشێت بەئێمەو و بە ئێوەش، لە پاشا ئەم شیعرەی نووسی:

| | |
|---|---|
| إني معزيك على أني على طمع | من الخلود ولكن سنة الديـــن |
| فما المعزى بباق بعد صـاحبه | ولا المعزي ولو عاشا إلى حين |

لە (عبد الله بن عمر)ەوە: کوڕێکی کۆچی کرد لە کاتی ناشتنندا لە لێواری گۆڕەکە دانیشتبوو پاشان بزەیەکی پێکەنینی کرد، پێی وترا: ئەوە چیە لە لێواری گۆڕەکەدا پێدەکەنیت؟ وتی: دەمەوێت شەیتان پەست بکەم.

لە ( حسن البصري ) ەوە: پیاوێك زۆر بێتاقەتی کوڕەکەی بوو سکاڵای هێنا بۆ لای (حسن البصری)، ئەویش فەرمووی: منداڵەکەت لێت دابڕاوە ؟ وتی: بەڵێ دابڕانەکەی زۆرترە لە ئامادەبوونەکەی، فەرمووی: وازی لێ بهێنە با بەو شێوە بێت چونکە هەموو دابڕانێکی دەبێتە مایەی خێرو پاداشت بۆ تۆ: وتی: ئەی ( أبو سعید ) دڵمت ئارام کردەوە.

( عمر )ی کوڕی( عبد العزیز ) چوو بۆ لای کوڕەکەی لەکاتی نەخۆشیدا،وتی : کوڕەکەم وەزعت چۆنە ؟ وتی: لە حەقدا دەمبینی . وتی : کوڕەکەم ئەگەر تۆ لە تەرازووی مندا بی پێم باشترە من لە تەرازووی تۆدا بم لە ڕۆژی دواییدا . وتی : ئەی باوکە ئەوەی تۆ پێت خۆشە پێم خۆشترە لەوەی کە خۆم پێم خۆشە .

یەکێك لە پێیەکانی ( عروة ) نەخۆشی خورکە لێی دا ،لە لاقەوە بڕیەوە ،لەکاتی بڕینەوە کەس نەیگرت لەگەڵ ئەوەشدا وازی لە زیکرو ویردەکانی ئەو شەوە نەهێنا تەنها ئەوە نەبێ کە وتی:﴿ لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴾(الکهف: ٦٢). واتە : بەڕاستی لەو سەفەرەماندا زۆر ماندوو بووین ،پاشان ئەم دێڕە شعرانەی خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| لعمري مـــــا أهويت كفي لريبة | ولا حملتني نحو فاحشة رجـــلي |
| ولا قادني سمعي ولا بصري لها | ولا دلني رأيي عليهـــــا ولا عقلي |
| وأعلـــم أني لم تصبني مصيبة | من الدهر إلا قد أصابت فتى قبلي |

ئينجا فەرمووى : خوايە ئەگەر تۆ بەلآت بەسەردا هێناوم ئەوا چاكت كردمەوە، ئەگەر بەشێك لە جەستەمت برد چەندين بەشت بۆم هێشتەوە، ئەگەر منداڵێكت بردەوە بۆلاى خۆت چەندين منداڵت بۆ بەجێهێشتم .

لە ئيمامى موسليم لە (ابو حسان ) ەوە دەڵێت : بە (ابو هريرة ) ەم وت : قسەيەكمان بۆ بكە كە دەروونمان ئارام بكات لە مردووەكانمان، وتى : بەڵێ،منداڵەكان پەپولەى بەهەشتن هەريەك لەوانە دەگات بە باوك و دايكى جلەكەى ڕادەكێشێ يا دەستى دەگرێ وازى لێ ناهێنێ هەتا دەيخاتە بەهەشتەوە[1] .

كەواتە بڕوانە بۆ بەرەكەتى منداڵ كوڕ بێ يان كچ ئەگەر بە منداڵى بمرن ئەوە لە دوا ڕۆژدا سوودو قازانج دەبەخشن بە باوك و دايكيان، بە مەرجێك ئەگەر ئارامگرين و بڵێن ( الحمد لله إنا لله وإنا إليه راجعون ) ئەو پاداشتەيان دەست دەكەوێت كە خواى گەورە پەيمانى پێداون، وەك دەفەرموێت:﴿ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴾(البقرة: ١٥٦). واتە : كە ئەوانەن هەر كاتێك تووشى بەلآو ناخۆشيەك دەبن دەڵێن؛ ئێمە موڵكى خواين و هەرچى هەمانە بەخششى خوايە،سەر ئەنجاميش تەنها هەر بۆ لاى ئەو زاتەيە گەڕانەوەمان.

لە ( ام سلمة ) ەوە ڕەزاى خوداى لێ بێت دەڵێت گوێم لە پێغەمبەرى خوا بوو دەيفەرموو : (ما من مُسْلِمٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فيقول ما أمَرَهُ الله ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴾ اللهم أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لي خَيْرًا منها إلا أخْلَفَ الله له خَيْرًا منها)[1]. واتە : هيچ

---

[1] – مسلم(٢٦٣٥).

[1] – مسلم(٩١٨).

موسڵمانێك نیە تووشی بەڵاو موسیبەتێك بێت و دوای ئەوە بڵێت کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ خودایە پاداشتم بدەوە لەو موسیبەتەی کە تووشم بووە و لە دوای ئەوە خێر و چاکەم بۆ بینەرێ، ئیللا لە جێگەی ئەوە خوا خێرو چاکەی بۆ دەنووسێت ،دواتر باشتری بۆ دەکا.

کاتێك کە (أبو سلمة) کۆچی دوایی کرد، وتم کێ لە موسڵمانان لە (أبو سلمة) باشترە، دواتر شووم بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، کەواتە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خستە جێگەی ئەو بۆ من.

ئەگەر خاوەن موسیبەتەکە توورەیی و بێزاری دەربڕی و داد و هاواری کرد، یا دەیدا بە ڕووخساری خۆیداو شیوەنی کرد، یا جل و بەرگی لەبەر خۆی دادەڕنی، یا قژی خۆی هەڵدەکەنی، ئەوە توورەیی و نەفرینی خوای بەسەردا دەبارێت.

# تاوانی پەنجا

## لە سنوور دەرچوون و دەست درێژی کردن و خۆ بەزل زانین (البغي)

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾(الشورى: ٤٢). واتە: بێگومان تەنها ئەوانە بەرپرس دەبن کە ستەم لە خەڵکی دەکەن و دەستدرێژی دەکەن بە ناحەق لە زەویدا، ئا ئەوانە سزاو ئازاری بە ئێشیان بۆ هەیە.

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (وَإِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلي أَنْ تَوَاضَعُوا حتى لَا يَفْخَرَ أَحَدٌ على أَحَدٍ ولا يَبْغِ أَحَدٌ على أَحَدٍ)[1]. واتە: بەڕاستی خوای گەورە فەرمانی کردووە کە خۆتان بەکەم بزانن و خاکی بن، هەتا هیچ کەس شانازی نەکات بەسەر یەکەوە، هیچ کەس خۆی لەکەسێکی تر بە گەورەتر نەزانێ.

هەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (ما من ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ الله تَعَالَى لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ في الدُّنْيَا مع ما يَدَّخِرُ له في الْآخِرَةِ مِثْلُ الْبَغْيِ وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ)[2]. واتە: خودا خێرا تۆڵەی گوناهی ستەم وهاموشۆنەکردنی خزمان هەر لە دونیا دەکاتەوە خوای گەورە قارِوونی برد بە ناخی زەویدا کاتێك کە خۆی بە گەورەتر زانی لە نەتەوەکەی، خوای گەورە دەربارەی هەواڵی داوە و دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُوْلِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ

---

[1] – مسلم(٢٨٦٥).

[2] – أبو داود(٤٩٠٢)، والترمذي(٢٥١١)، وقال: حديث حسن صحيح)، وابن ماجه(٤٢١١) وصححه الشيخ الألباني.

ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَيْلَكُمْ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لِّمَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴾(القصص: ٧٦ – ٨١). واتە: بێگومان قارووون لە قەوم و خۆیشانی موسی بوو کەچی( بەهۆی ماڵ و سامانەوە ) خۆی گیف دەکردەوە بەسەریانداو فیزی بەسەردا دەکردن، ئەوەندە ماڵ و سامان و داراییمان پێبەخشی بوو، کە بەڕاستی کلیلی گەنجینەو قاسەکانی بە چەند کەسێکی بەهێز و بە گرانی هەڵدەگیران، (لەکاتی لووت بەرزیەکەیدا) هەندێك ئیماندارانی خزم و کەسی خۆی پێیان وت: کەشخە مەکەو لەخۆبایی مەبە بەم سامانە، چونکە بێگومان خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە کەشخە دەکەن بەپارە و سامانیانەوە و لە خۆبایی دەبن. هەوڵ بدە بەو ماڵ و سامانەی خوا پێی بەخشیووی ماڵی قیامەت و بەهەشتی بەرینی پێ بکڕە و بەشی خۆیشت لە دونیادا بە حەلاڵی فەرامۆش مەکە، چاکە لەگەڵ بەندەکانی خوادا بکە هەروەك خوا چاکەی هێناوەتە ڕێت، نەکەی هەوڵی فەساد و گوناهو تاوان بدەی لە زەویدا، چونکە بەڕاستی خوا ئەوکەسانەی خۆش ناوێت کە تۆوی خراپە دەچێنن. قارووون وتی: بێگومان ئەم سامان و دارییەم هەر بەهۆی زانست و زانیاری و نەخشەی خۆمەوە پێم دراوە، باشە مەگەر قارووون نەیدەزانی بەڕاستی خوا پێش ئەم چەندەها گەل و هۆز و قەومی لەناو بردووە کە لەو زیاتر بەدەسەڵاتترو دەوڵەمەندتر بوون ؟ تاوانباران پرسیاریان لێ ناکرێت دەربارەی گوناهەکانیان( چونکە تۆمارە لای خوا و ئاشکرایە ). ئینجا ڕۆژێك قارووون خۆی سازداو بە ڕازاوەییەوە چووە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی بۆ کەشخە کردن و خۆنواندن، ئەوانەی کە ئاواتیان ژیانی دونیایە، وتیان: خۆزگە ئێمەش وەکو قارووون، سامان و دەسەڵاتمان

هەبوایە، بەڕاستی خاوەنی بەختێکی گەورەیە! ( بەڵام ) ئەوانەی کە زانست و زانیاری ڕاستیان پێبەخشراوە( دەربارەی حەڵاڵ و حەرام و نرخی دونیا دەزانن ) وتیان: هاوار بۆ ئێوە، بۆ تێنافکرن پاداشتی خوایی زۆر چاکترە بۆ ئەو کەسەی باوەڕی دامەزراوی هێناوە کارو کردەوەی چاکی ئەنجام داوە، ئەو زانست و باوەڕو کردەوەیە بە کەس نادرێت، تەنها بە خۆڕاگری و ئارامگران نەبێت. ئەوسا ( کە بینیمان قارون بە تەواوی لە سنوور دەرچووە ) کوتوپڕ خۆی و ماڵ و سامانیان برد بەناخی زەویدا، هیچ دەستەو گرۆیەکی نەبوو فریای بکەوێت و لە دەست خەشم و قینی خوا دەربازی بکات، بێگومان لەو کەسانەش نەبوو کە بتوانێت خۆی ڕزگاری ببێت.

(ابن الجوزي) دەڵێت: وشەی (بغی) (دەرچوون و ستەم)لەمەسەلەی قارون دا بەم مانایانە هاتووە:

یەکەم: لەسنوور دەرچوونەکەی قارون لەوەدا بوو کە بە پارە قەناعەتی بە ژنێك کرد (موسی) (علیە السلام) تۆمەتبار بکات بە داوێن پیسی، ئەویش ئەوەی کرد، (موسی) سوێندی دا لەسەر ئەو بوهتانە، ئینجا هەواڵی ئەوەی دا کە لەگەڵ قاروندا ئەو پلانەیان داناوە.

دووەم: لە سنوور دەرچوونی بەهۆی بێباوەڕ بوونیەوە بوو بە خوای گەورە، ئەمە وتەی (الضحاك) ە .

سێیەم: بە خۆبەزل زانین، ئەمە وتەی (قتادة) یە.

چوارەم: قارون جلەکەی یەك بست درێژ تر کردووە، ئەمە وتەی(عطاء الخراساني).

پێنجەم: قارون خزمەتکاری فیرعون بووە و ستەمی لە (بني اسرائیل) کردووە، (الماوردي) گێڕایەتیەوە.

﴿ فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ ﴾ کاتێك کە قارون فەرمانی کرد بەو ئافرەتە (موسی) تۆمەتبار بکات، (ابن عباس) دەڵێت: خوای گەورە ڕۆی کرد بەناخی زەویدا.

﴿ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ واته: هیچ کۆمەڵ و دەستەیەك نەبوو ڕزگاری بکات لە سزای خوا، ﴿ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴾ یەکێك بوو لەوانەی کە ڕازی نەبوو بەوەی کە خوای گەورە دایبەزاندووە.

## تاوانی پەنجاو یەك

### خۆ بەگەورە زانین بەرامبەر بە بێ نەوایان و خزمەتکاران و ژێردەستەو ئاژەڵدا

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴾( النساء: ٣٦). واتە: ( ئەی خەڵکینە ) تەنها خوا بپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن و چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکتان و خزمان و هەتیووان و هەژاران و دراوسێی و خزم و دراوسێی بێگانەو هاوەڵی کارو سەفەرو ڕێبوارو ژێر دەستەکانتاندا، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش ناوێت کە خۆ دەنوێنن و فیزدەکەن و فەخر دەفرۆشن بەسەر خەڵکیدا.

( الواحدي ) دەڵێت: لە ڕاڤەی ئەم دەقەدا: ﴿وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ ﴾. (معاذ) ی کوڕی(جبل) دەڵێت: (كنت رِدْفَ النبي صلى الله عليه وسلم على حِمَارٍ يُقَالُ له عُفَيْرٌ فقال يا مُعَاذُ، هل تَدْرِي حَقَّ اللَّهِ على عِبَادِهِ وما حَقُّ الْعِبَادِ على اللَّهِ؟ قلت: الله وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قال: فإن حَقَّ اللَّهِ على الْعِبَادِ أَنْ يَعْبُدُوهُ ولا يُشْرِكُوا بِهِ شيئا، وَحَقَّ الْعِبَادِ على اللَّهِ أَنْ لَا يُعَذِّبَ من لَا يُشْرِكُ بِهِ شيئا)[1]. واتە: لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ بەسەر گوێدرێژکەوە بووم پێی دەوترا(عُفَيْرٌ) فەرمووی: موعاز دەزانی مافی خوای گەورە چییە لەسەر بەندەکانی؟، مافی بەندەکانیش چییە لەسەر خوای گەورە ؟ وتم: خواو پێغەمبەرەکەی باشتر دەیزانن، فەرمووی: لە ڕاستیدا مافی خوای گەورە لەسەر بەندەکانیەوە ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچ جۆرە شەریك و هاوەڵێکی بۆ پەیدا نەکەن، مافی بەندەکانیش لەسەر خوای گەورە ئەوەیە کە سزای ئەو کەسە نەدات کە شەریك و هاوەڵی بۆ پەیدا ناکات.

---

[1] – البخاري(٥٩٦٧)، ومسلم(٣٠).

لە(عائشة)ەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی: (ما زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حتى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ)[١]. واتە: جبریل هێندە ڕایسپاردم كە لەگەڵ دراوسێ چاك بم، تا وا گومانم برد كە دراوسێ میرات لە دراوسێكەی دەبات.

لە (أسامة) ەوە دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا دەیفەرموو: (من جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لم يَنْظُرْ الله إليه يوم الْقِيَامَةِ)[٢]. واتە: هەركەس جل و بەرگی شۆڕبێ و بەسەر زەویدا لەبەر فیزو لە خۆبایی بوون بكشێ، خوا لەڕۆژی دواییدا سەیری ناكات.

(أبو مسعود) دەڵێت: بە قامچی لە كۆیلەكەم دەدا گوێم لە دەنگێك بوو لە پشتمەوە وتی: بزانە (أبو مسعود) خوای گەورە توانای لەوە زیاتر كە تۆڵەی ئەو منداڵەت لێ بكاتەوە. وتی: وتم: ئیتر لە ژیانمدا ئازاری هیچ كۆیلەیەكم نادەم، لە ڕیوایەتێكی تردا دەڵی: لە هەیبەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ قەمچیەكە لەدەستم كەوتە خوارەوە، لە ڕیوایەتێكی تردا: وتم: ئەوە لەبەر خوا ئازادم كرد، وتی: بەلام ئەگەر ئەوە نەكەی ئاگر دەتسوتێنێت[٣].

لە (ابن عمر)وە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (من ضَرَبَ غُلَامًا له حَدًّا لم يَأْتِهِ أو لَطَمَهُ فإن كَفَّارَتَهُ أَنْ يُعْتِقَهُ)[١]. واتە: هەركەسێك داركاری خزمەتكارەكەی بكات لەسەر تاوانێك كە نەیكردبێت یا مستێكی لێدا ، قەرەبووەكەی ئازادكردینیەتی.

لە (حكيم)ی كوڕی(حزام) وە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ فِي الدُّنْيَا)[٢]. واتە: خوای گەورە سزای ئەوكەسانە دەدەات كە سزای خەڵكی دەدەن لە دونیادا.

---

[١] – البخاري(٥٩٦٧)، ومسلم(٣٠).

[٢] – البخاري(٦٠١٤)، ومسلم(٢٦٢٤).

[٣] – مسلم(١٦٥٩).

[١] – مسلم(١٦٥٧).

له (صەحیحی) بوخاری و موسلیمدا هاتووه پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من قَذَفَ مَمْلُوكَهُ بالزنى يُقَامُ عليه الْحَدُّ يوم الْقِيَامَةِ إلا أَنْ يَكُونَ كما قال)[٣]. واته: هەركەسێك كۆیلەكەی تۆمەتبار بكات به زینا كردن ئەویش بێ تاوان بێت لەو تۆمەته، له ڕۆژی قیامەتدا داركاری دەكرێت ئیللا مەگەر ئەوەی وتبێتی ڕاست بێت. له فەرموودەیەكی تردا هاتووه: (لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ ولا يُكَلَّفُ من الْعَمَلِ إلا ما يُطِيقُ)[٤]. واته: دەبێت خزمەتكار خواردن و جل و بەرگی باشی بۆ دابین بكرێت، شتێك نەدرێت بەسەریدا كه له توانایدا نەبێت.

## بـەش

له گەورەترین بێ ڕێزیی بەرامبەر به خزمەتكارو ژێردەسته جیاكردنەوەیه له نێوان ئەوو منداڵەكەیدا، یا ئەوو براكەیدا.

وه یەكێكی تر لەو تاوانه گەورانه ئەوەیه كه خزمەتكارو ژێردەسته و ئەو ئاژەڵەی له ژێر دەستی دایه به برسێتی بیانهێڵێتەوه. پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ)[١]. واته: بەسه كەسێك بەتاوانبار دابنرێت كه ڕێگری بكات لەوەی له ژێر دەستی دایه له خواردن و خواردنەوه.

وه یەكێكی تر لەو تاوانه گەورانه ئەوەیه كه بدات له ئاژەڵەكەی به لێدانێكی توند یا زیندانی بكات و خواردن و خواردنەوەی نەداتێ یا بارێك بخاته سەر شانی كه له توانایدا نەبێت، له ڕاستیدا له تەفسیری ئەم دەقەدا هاتووه: ﴿ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُم ﴾ (الأنعام:٣٨). واته: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێك نیه بەسەر

---

[٢] – مسلم(٢٦١٣).

[٣] – البخاري(٦٨٥٨)، ومسلم(١٦٦٠).

[٤] – مسلم(١٦٦٢).

[١] – مسلم( ٩٩٦).

زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەك بە باڵەكانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێك نەبن وەك ئێوە. وترا: هەموو گیاندارەكان دەهێنن لە ڕۆژی دوایدا، ئینجا لە پێش چاوی خەڵك دادگایی دەكرێت لە نێوانیاندا، هەتا مافی بەرانێكی بێشاخ لە بەرانێكی شاخدار وەردەگیرێت، هەتا تۆڵەی تۆسقاڵێك بە تۆسقاڵێك دەكرێتەوە، پاشان پێیان دەوترێت ببن بە خۆڵ، لەو كاتەدا كافرو بێ باوەڕ دەڵێت: خۆزگە منیش خۆڵ ببوایەم[١].

ئەمە یەكێكە لەو بەڵگانەی كە دادگایی لە نێوان سەرجەم ئاژەڵەكاندا دەكرێ و بە هەمان شێوەش لە نێوان نەوەكانی ئادەمدا، هەتا ئەگەر كەسێك بە ناحەق داركاری ئاژەڵەكەی بكات یان بە برسێتی و تینوێتی بیهێڵێتەوە، یا بارێك بخاتە سەر پشتی و لە توانایدا نەبێت، ئەوە لە ڕۆژی دوایدا تۆڵەی لێدەكرێتەوە بە پێی ئەو ستەمەی كە كردوویەتی لە ئاژەڵەكەی، لە (صەحیحی) بوخاری و موسلیمدا هاتووە (عُذِّبَتْ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ سَجَنَتْهَا حتى مَاتَتْ فَدَخَلَتْ فيها النَّارَ لَا هِيَ أَطْعَمَتْهَا ولا سَقَتْهَا إِذْ حَبَسَتْهَا ولا هِيَ تَرَكَتْهَا تَأْكُلُ من خَشَاشِ الأرض)[٢]. واتە: خودا ئەو ژنە دەخاتە دۆزەخ بەهۆی ئەوەی پشیلەیەكی بەندكرد بێئەوەی خواردن و خواردنەوەی پێ بدات تا لە برسا مرداربوو.

بە هەمان شێوە لە (صەحیحدا) هاتووە كە پێغەمبەری خوا ئافرەتێكی بە هەڵواسراوی بینیوە لە دۆزەخدا و پشیلەیەكیش چڕنووكی دەدا بە ناوچاوان و سنگیدا،سزای دەدا وەك چۆن ئەو لە دونیادا سزای ئەوی دەدا بە برسێتی و زیندانی كردن.

ئەم فەرموودەیە گشتییە بۆ سەرجەم ئاژەڵەكان، بە هەمان شێوەش ئەگەر بارێك بخاتە سەر كۆڵی و لە توانایدا نەبێ ئەوە تۆڵەی لێدەكرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا وەك چۆن لە (صەحیحی) بوخاری و موسلیمدا هاتووە كە لە ڕاستیدا پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (بَيْنَا رَجُلٌ يَسُوقُ بَقَرَةً إِذْ رَكِبَهَا فَضَرَبَهَا فقالت إِنَّا لم نُخْلَقْ لِهَذَا إنما خُلِقْنَا لِلْحَرْثِ)[١]. واتە:

---

١ – مسلم(٢٥٨٢).

٢ – البخاري(٣٣١٨)، ومسلم(٢٢٤٢).

١ – البخاري(٧٤).

لە کاتێکدا پیاوێك مانگایەکی بەڕێگادا دەبرد سواری بوو ئینجا لێی دا، مانگاکە وتی: بۆ ئەمە دروست نەکراوین بە ڵکو بۆ کێڵان دروست کراوین.

ئەمە ئەو مانگایەیە کە خوای گەورە هێنایە قسەکردن بۆئەوەی بەرگری لە خۆی بکات لە دونیادا، چونکە ئەو بۆ ئەوە دروست نەکراوە ئازار بدرێت وبارێکی قورس بدرێت بە کۆڵیدا، هەر کەسێك ئەوە بکات یان دارکاری بکات ئەوە لە ڕۆژی دوایدا، بە گوێرەی ئەوە تۆڵەی لێدەکرێتەوە .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە ئاژەڵ زیندانی بکرێت تا مردار دەبێتەوە، [٢]. تەنانەت ئەگەر ئەو گیاندارانەش بێت کە شەرع ڕێگەی داوە بە کوشتنیان وەك مارو مشك و دووپشك هەروەها سەگی هار دەبێت بە یەکەم لێدان بکوژرێن و سزا نەدرێن چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فإذا قَتَلْتُمْ فَأَحْسِنُوا الْقِتْلَةَ وإذا ذَبَحْتُمْ فَأَحْسِنُوا الذَّبْحَ وَلْيُحِدَّ أحدكم شَفْرَتَهُ فَلْيُرِحْ ذَبِيحَتَهُ)[١]. واتە: ئەگەر کوشتتان بە باشی بیکوژن وە ئەگەر سەرتان بڕی بە باشی سەری ببڕن با یەکێك لە ئێوە چەقۆکەی تیژ بکا و بەبێ ئازاردانی بە ئاسانی سەری ببڕێ.

بەهەمان شێوە نابێ بە ئاگر بسوتێنرێت، چونکە لە فەرموودەی (صەحیحدا) هاتووە کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی : (إني أَمَرْتُكُمْ أَنْ تُحْرِقُوا فُلَانًا وَفُلَانًا وَإِنَّ النَّارَ لَا يُعَذِّبُ بها إلا الله فَإِنْ وَجَدْتُمُوهُمَا فَاقْتُلُوهُمَا)[١]. واتە: من فەرمانم پێکردن کە فلان و فلانکەس بە ئاگر بسوتێنن، لە راستیدا ئاگر کەس ناتوانێت سزای پێ بدات جگە لە خوای گەورە نەبێ، ئەگەر دۆزیانتانەوە بیانکوژن.

---

[٢] – البخاري(٥٥١٣)، ومسلم(١٩٥٦).

[١] – مسلم(١٩٥٥).

[١] – البخاري(٢٩٥٤).

## بەشێكی تر

باش نیە ئاژەڵ بە گاڵتە بكوژرێت ،بەهەمان شێوە باش نیە باڵندە ڕاو بكرێت لەو كاتەی كە كڕ دەكەوێت بەسەر هێلكەدا یا بێچووی هەبێت، هەروەها باش نیە ئاژەڵ لەبەرچاوی دایكەكەیدا سەرببڕێ؟! .

## بەشێكی تر

### دەربارەی ئازادكردنی كۆیلە

(ابو هريرة ) دەڵێت : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : (من أَعْتَقَ رَقَبَةً مُسْلِمَةً أعْتَقَ الله بِكُلِّ عُضْوٍ منه عُضْوًا من النَّارِ حتى فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ)[٢]. واتە: هەركەسێك كۆیلەیەك ئازاد بكات خوای گەورە بە هەر ئەندامێكی ئەندامێكی ئەو لە ئاگر دەپارێزێت، تەنانەت داوێنیشی بە داوێنی دەپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ.

---

[٢] - البخاري(٦٧١٥)، ومسلم(١٥٠٩).

# تاوانی پەنجاو دوو

## ئازاردانی دراوسێ

له (صەحیحی) بوخاری و موسلیمدا هاتووه پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (والله لَا يُؤْمِنُ والله لَا يُؤْمِنُ، والله لَا يُؤْمِنُ، قِيلَ: وَمَنْ يا رَسُولَ اللّه؟ قال: الذي لَا يَأْمَنُ جَارُهُ بوائقه)[1]. واته: سوێند بەخوا ئیمان و بڕوای نیه.(سێ جار دووبارەی کردەوە)، عەرزیان کرد: کێ ئەی پێغەمبەری خوا ؟ فەرمووی ئەو کەسەی کە دراوسێکەی لە شەڕو بەدڕەفتاریەکانی ئەمین و بێ خەم نیە.

پیاوێك بە پێغەمبەری خوای وت: چی تاوانێك لای خوای گەورە زۆر گەورەیە؟ ئەویش فەرمووی: (أَنْ تَجْعَلَ لِلّهِ نِدًّا وهو خَلَقَكَ) [2] لەگەڵ خوادا شتێك هاوتا بکەیتەوە لە پەرستندا لەگەڵ ئەوەدا خوای گەورە دروستی کردووی)). وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (وَأَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ تَخَافُ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ) منداڵەکەت بکوژیت لەترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات )) وتی: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ) زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەتدا بکەیت)).

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: (من كان يُؤْمِنُ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فلا يُؤْذِ جَارَهُ)[3]. واته: هەرکەس بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێکەی نەدا.

---

[1] - البخاري(٦٠١٦).

[2] - البخاري( ٤٤٧٧)، ومسلم (٨٦) .

[3] - البخاري( ٦٠١٨)، ومسلم (٤٧) .

پێویستە دراوسێ توانای ئەوەی هەبێ کە ئازاری دراوسێکەی هەڵبگرێت، ئەمەش یەکێکە لەو چاکانەی کە لە گەڵ دراوسێدا دەکرێت.

(أبو هريرة) دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ سکاڵای لە دراوسێکەی دەکرد پێی فەرموو: (( برۆ ئارام بگرە ))، بۆ جاری دووەم یا سێیەم گەڕایەوە خزمەتی ئینجا فەرمووی: (( برۆ کەلوپەلی ماڵەکەت فڕێ بدەرە سەر ڕێگاکە )) ئەویش ئەمەی کرد، هەرکەس تێپەر دەبوو بەلایدا پرسیاری لێدەکرد بۆ حاڵت بەم شێوەیەیە؟ ئەویش هەواڵی دراوسێکەی پێدەدان کە لەگەڵی خراپە، ئەوانیش یەکە بەیەکە نەفرەتیان لێ دەکرد و دەیان وت: دەك خوا واو وای لێ بکات نزای خراپیان لێدەکرد، ئینجا دراوسێکەی هات بۆ لای وتی: براکەم بگەڕێرەوە ماڵەکەی خۆت ،هەرگیز ئەوشتە نابینیت ئازارت بدات(١).

# تاوانی پەنجاو سێ

## جنێو پێدان وئازاردانی موسڵمانان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾(الأحزاب: ٥٨). واتە: ئەوانەش کە ئازاری پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێ ئەوەی تاوانێکیان ئەنجامدابێت، ئەوە بەڕاستی بوختان و گوناهو تاوانێکی ئاشکرا دەگرنە ئەستۆ ( بێگومان بەسەریانەوە ناچێت تۆڵەیان لێ دەسەنرێت ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُوا۟ خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَآءٌ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ ۖ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَـٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾(الحجرات: ١١). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! هیچ کەس و هیچ هۆزێك گاڵتە بەکەس و هۆزێکی تر نەکات و زەلیلی نەکات، چونکە لەوانەیە ئەوان چاکتر بن لەمان، ژنانیش با گاڵتە بەیەکتر نەکەن و یەکتر زەلیل نەکەن، چونکە لەوانەیە ئەمان لەوان چاکتر بن ... سووکایەتی بە خۆتان مەکەن و یەکتری عەیبدار مەکەن ( چونکە سووکایەتی بە یەکتر سووکایەتییە بە خۆتان ) هەروەها ناوو ناتۆرەی ناشیرین بۆ یەکتر دامەتاشن، ئای کەچەند ناشیرینە ناوو ناتۆرەی خراپ لەدوای باوەڕهێنان و موسڵمان بوون، ئەوکەسە تەوبەی نەکردبێت و پەشیمان نەبووبێتەوە لە گوناهەکانی، ئا ئەو جۆرە کەسانە هەرستەمکارن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ ﴾(الحجرات: ١٢). واتە: سیخوڕی مەکەن و لەپاش ملە باسی یەکتری و ناوی یەکتری بەخراپ مەبەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ شَرَّ الناس مَنْزِلَةً عِنْدَ اللَّهِ من تَرَكَهُ أو وَدَعَهُ الناس اتِّقَاءَ فُحْشِه)[١]. واتە: لە ڕاستیدا خراپترین کەس لە لای خوای گەورە ئەوەیە کە خەڵکی وازی لێ بهێنن یا بەڕێی کەن لەبەر خراپەکاری و زمان پیسی .

هەروەها ﷺ فەرموویەتی: (الْمُسْلِمِ على الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ)[٢]. واتە: خوێن و،ماڵ و،ناموسی موسڵمان لەسەر موسڵمان قەدەغەیە .

وە لە فەرموودەیەکی تردا فەرموویەتی: (الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لَا يَظْلِمُهُ ولا يَخْذُلُهُ ولا يَحْقِرُهُ التَّقْوَى ها هنا وَيُشِيرُ إلى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ بِحَسْبِ امْرِئٍ من الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ)[١]. واتە: موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێ ناکاو سەرشۆڕی ناکاو بەکەمی نازانی، پاشان ئاماژەی بۆ سینگی کرد، سێ جار فەرمووی : تەقواو لە خواترسان لێرەدایە، مرۆڤ چەندبێڕێزی بەرامبەر براکەی ئەنجام بدات ئەوەندە تاوانی دەگات .

هەروەها لە فەرموودەی (صەحیحدا) هاتووە: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ)[١]. واتە: جنێودان بە موسڵمان فاسق بوونە و کوشتنیشی بێ باوەڕ بوونە .

(ابو هريرة) دەڵێت : وتیان ئەی پێغەمبەری خوا،فلاْن ئافرەت بە شەو شەو نوێژ دەکاو بە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێ، کاری چاکە دەکاو بە زمانی دراوسێکەی ئازار دەدات، فەرمووی: هیچ خێرێك لەو ئافرەتەدا نیە، ئەوە لە ئەهلی دۆزەخە ([٢]).

---

[١] — البخاري ( ٥٤٦٠ )، ومسلم ( ٢٥٩١ ) .

[٢] — مسلم (٢٥٦٤) .

[١] — البخاري (٢٤٤٢)، وليس فيه ( ولا يحقره.... إلى نهاية الحديث )، ومسلم ( ٢٥٦٤ ) .

[١] — البخاري ( ٤٨ )، ومسلم ( ٦٤ ) . و

[٢] — الجاكم في المستدرك ٤\١٦٦، وصححه ووافقه الذهبي .

پێغەمبەری خوا دەفەرموێت : (وَمَنْ دَعَا رَجُلًا بِالْكُفْرِ أو قال عَدُوَّ اللَّهِ وَلَيْسَ كَذَلِكَ إلا حَارَ عليه)[٣]. واتە : هەرکەسێ بانگی کەسێك بکات بە کافر یا بڵێت ئەی دوژمنی خوا ئەو کەسەش بەو شێوە نەبێت ،بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ خۆی .

## بــەش

### دەربارەی ترساندن و تێکدان وهاندان لە نێوان موسڵماناندابۆشەڕ و فیتنەو هەروەها لە نێوان ئاژەڵ و گیاندارانیشدا

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی:(إِنَّ الشَّيْطَانَ قد أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ)[٤]. واتە:لە ڕاستیدا شەیتان بێ هیوا بووە لەوەی کە نوێژخوێنەکان لە دوورگەی عەرەبیدا بەندایەتی بکەن ،تەنیا دەتوانێ لە هاندانی شەڕو فیتنە لە نێوان یەکتریدا.

هەرکەس هانی دوو کەس بدات لە نەوەکانی ئادەم، قسەی خراپ لە نێوانیاندا بهێنی و بیات ئەوە دوو زمانەو لە حزبی شەیتانەو لە خراپترینی مرۆڤەکانە .

لە فەرموودەی (صەحیحدا) هاتووە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ)[١]. واتە : (دووزمان) ناچێتە بەهەشتەوە کەسێك قسە بهێنێت و قسە ببات.

وە (النمام):ئەو کەسەیە کە قسەی خراپ لە نێوان خەڵکیدا دەهێنێ و دەبات بۆ نموونە لای کەسێك دەڵێت: فلان کەس ئاواو وئاوهای پێت وت یا ئەوەو ئەوەی دەکرد.

---

[٣] – مسلم(٦١) .

[٤] – مسلم(٢٨١٢).

[١] – البخاري(٦٠٥٦)، ومسلم(١٠٥).

هاندانی ئاژەڵ و گیانداروو باڵندە بۆ بەشەڕهێنانیان لەگەڵ یەكتر حەڕامە وقەدەغەیە وەكو بەشەڕ دادانی كەڵەشێر یان بەران یان سەگ یا هاوشێوەی ئەمانە ، بەڕاستی ئەم كردارانە پێغەمبەری خوا قەدەغەی كردووە.

## بەشێكی تر

### دەربارەی هاندان بۆ چاكەكردن لە نێوان خەڵكیدا

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ ﴾(النساء: ١١٤). واتە: لە زۆربەی چپەو سرتەو قسە نهێنییەكانیاندا هیچ خێرێك بەدی ناكرێت و تیایدا نیە، مەگەر چپەی ئەو كەسەی كە فەرمان بدات بە بەخشینێك یان چاكەیەك، یان ڕێكخستن و چاكسازی و ئاشتبوونەوەیەكی نێوان خەڵكی، جا ئەوەی ( ئەو شێوازە چاكەیە ) ئەنجام بدات و مەبەستی تەنها دەستكەوتنی ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوە لە ئایندەدا پاداشتی زۆرو بێ سنوورو گەورەی پێدەبەخشین.

لە فەرموودەدا هاتووە: (ليس الْكَذَّابُ الذي يُصْلِحُ بين الناس فَيَنْمِي خَيْرًا أو يقول خَيْرًا)[٢]. واتە: درۆزن بەو كەسە ناوترێت كە ئاشتەوایی ئەكات و نێوانی خەڵكی چاك ئەكات، قسەكانی بە شێوەیەك ئەكات كە خێر بداتەوە یاخود چاك ئەڵێت.

(أم كلثوم) – ڕەزای خوای لێبێت - دەڵێت: گوێم لێ نەبووە پێغەمبەرﷺ ڕێگە بە هیچ شتێك بدات لەوەی كە خەڵكی دەیڵێن ئیللا لە سێ شتدا نەبێ: لە جەنگدا، لە ئاشتەوایی لە نێوان خەڵكدا، قسە كردنی پیاو بۆ ژنەكەی، یا ژن بۆ پیاوەكەی.

---

٢ – البخاري(٢٦٩٢).

(سهل)ی کوڕی (الساعدي) دەڵێت: هەواڵ درا بە پێغەمبەری خواﷺ کە نەوەکانی (عمرو)ی کوڕی (عوف)، شەڕو ئاژاوە لە نێوانیاندا درووست بووە، پێغەمبەری خواﷺ لە گەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی دەرچوو بۆ ئەوەی ئاشتەوایی بخاتە نێوانیانەوە[٢].

[٢] - البخاري(٢٦٩٠).

## تاوانی پەنجاو چوار

## ئازاردانی بەندەكانی خوای گەورە و دەستدرێژیكردنە سەریان

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْذُونَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ بِغَيْرِ مَا ٱكْتَسَبُوا۟ فَقَدِ ٱحْتَمَلُوا۟ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾(الأحزاب: ٥٨). واتە: ئەوانەش كە ئازاری پیاوانی ئیماندارو ئافرەتانی ئیماندار دەدەن بێ ئەوەی تاوانێكیان ئەنجامدابێت، ئەوە بەڕاستی بوختان و گوناهو تاوانێكی ئاشكرا دەگرنە ئەستۆ( بێگومان بەسەریانەوە ناچێت و تۆڵەیان لێ دەسێنرێت ).

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾(الشعراء ٢١٥). واتە: باڵی بەزەیی و میهرەبانی خۆت نەوی بكە بۆ ئەو ئیماندارانەی كە شوێنت كەوتوون.

( أبو هريرة ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت: (من عَادَى لي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ)[٣]. واتە: هەركەس دوژمنایەتی دۆست و (ولي) یەكی من بكات، ئەوە جەنگ لەدژی بەرپا دەكەم.

لە ڕاستیدا (أبو سفيان) هات بۆ لای (سلمان) و (صهيب) و (بلال) لە گەڵ چەند كەسێكدا وتیان: شمشێری خوات وەرگرتووە لە دوژمنی خوا و مافت پێی نەداوە، أبو بكر وتی: ئایا چۆن ئەوە دەڵێن بەرانبەر گەورەو پێشەوای قورەیش ؟ ئینجا هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ بۆی گێڕاوە، پێغەمبەری خوا فەرمووی: (يا أَبَا بَكْرٍ لَعَلَّكَ أَغْضَبْتَهُمْ لَئِنْ كُنْتَ أَغْضَبْتَهُمْ لقد أَغْضَبْتَ رَبَّكَ). واتە: ئەی (أبو بكر) لەوە ئەچی تۆڕەیانت كردبێ، ئەگەر تۆ ئەوانت تورە كردبێ ئەوە خوای گەورەت تورە كردووە. پاشان (أبو بكر) هات بۆ لایان وتی: ئەی براكانم وابزانم تورەتانم كرد ؟ وتیان: نەخێر، خوای گەورە لە تۆو لە ئێمەش خۆش بێت.

---

[٣] — البخاري(٦٥٠٢).

# بـــەش

دەربارەی ئەم ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾(الكهف: ٢٨). واتە: ئارام بگرەو خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە خوا پەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان وێردی سەرزاریانە لەبەرە بەیان و دەمەو ئێواراندا، مەبەستیانە و دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن، ڕوو لەوان وەرمەگێڕە و ( ڕوومەکە دونیاپەرستان و دەوڵەمەندان ) لە کاتێکدا تۆ زینەت و ڕازاوەیی ژیانی دونیات بوێت.

ئەم ئایەتانە دەربارەی هەژاران دابەزیوە، هۆی دابەزینی ئەوەیە کە: پێغەمبەرﷺ یەکەم کەس کە باوەڕی پێی هێنا هەژار بوو، بە هەمان شێوە هەر پێغەمبەرێك کە نێردرابێت یەکەم کەس هەژار باوەڕی پێ هێناوە، پێغەمبەری خوا بەردەوام لەگەڵ هەژارانی نەتەوەکەی خۆیدا دادەنیشت، وەك (سلمان) و (صهيب) و (بلال) و (عمار )ی کوڕی( یاسر)، موشریك و بتپەرستەکان ویستیان هەژارەکانی لێ دووربخەنەوە، چونکە دەیانزانی نیشانەی پێغەمبەران ئەوەیە کە یەکەم شوێنکەوتەیان هەژارانە.

هەندێ لە پیاو ماقووڵانی موشریکەکان وتیان: ئەی (محمد) هەژارەکان لە خۆت دووربخەرەوە، چونکە نەفسوو ئارەزوومان ڕێگەمان نادات لەگەڵیاندا دابنیشی، ئەگەر لە خۆت دووریان بخەیتەوە ئەوە پیاو ماقووڵان بڕوات پێ دەهێنن، پاشان ئەم دەقە دابەزیە خوارەوە: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴾(الأنعام: ٥٢). واتە: ( ئەی محمد ئەی ئیماندار ) نەکەیت ئەوانە دەربکەیت ( لە مزگەوت و کۆڕی خواناسین ) کە لە بەیانیان و ئیواراندا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە و( دەیپەرستن ) مەبەستیشیان تەنها ڕەزامەندی ئەوە.

کاتێك کە نا ئومێد بوون لە دوورخستنەوەی هەژارەکان وتیان؛ ئەگەر دووریان ناخەیتەوە ڕۆژێك بۆ ئێمە دیاری بکەو ڕۆژێکیش بۆ ئەوان، پاشان ئەم دەقە دابەزی: ﴿

وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ﴾ (الكهف: ٢٨). واتە: (ئارام بگرەو خۆت ڕابگرە لەگەڵ ئەوکەسانەدا کە خواپەرستی دەکەن و یادی پەروەردگاریان ویردی سەرزاریانە لەبەرە بەیان و دەمەو ئیواراندا، مەبەستیانەو دەیانەوێت کە ئەو زاتە لە خۆیان ڕازی بکەن، ڕوو لەوان وەرمەگێڕە تۆ زینەت و ڕازاوەیی ژیانی دنیات بوێت ). ستەمیان لێ مەکەو بە جیاواز تەماشایان مەکە و شوێنی ئارەزوومەندانی دونیا مەکەوە: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴾(الكهف: ٢٩). واتە: پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە کە لە لایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانە کراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت. پاشان نموونەی هەژارو دەوڵەمەندی هێناوەتەوە، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيۡنِ ﴾ (الكهف: ٣٢). واتە: ئەی محمد ﷺ نموونەیان بۆ بهێنەرەوە بە دوو پیاو. ﴿ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴾(الكهف: ٤٥). واتە: ئەی محمد ﷺ نموونەیان بۆ بهێنەرەوە دەربارەی ژیانی دونیا . بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی تەواوی لە هەژاران دەگرت .

کاتێك پێغەمبەری ئیسلام ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە هەژارەکان لە گەڵیدا کۆچیان کرد، ئەوان لە سووچی مزگەوتێکدا دەمانەوە بۆیە ناو نران بە هاوەڵانی ( الصفة)، ئەم ناوە دراوە پاڵ ئەو کۆچکردووە هەژارانە هەتا زۆر بوون .

ئەوانە چێژی ئیمان و باوەڕیان وەرگرت کە خوای گەورە خەڵاتی کردبوون، چونکە ئەوان دڵیان بەهیچی ترەوە نەبەستبوو لەم دونیایەدا، بەڵکو دەیان وت: تەنها تۆ دەپەرستین و ملکەچی تۆ دەبین و سوژدە بۆ تۆ دەبەین و داوای ڕێنمایی هەر لە تۆ دەکەین و، تەنها پشت بە تۆ دەبەستین و، بەیادی تۆ دڵخۆش دەبین و، تەنها لە بەر ڕەزامەندی تۆ کردەوەی چاکە دەکەین، هەرگیز لە دەرگای تۆ دوور ناکەوینەوە، لەبەر ئەوەیە ڕێگەیان بۆ خۆش کراو خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی فەرموو: ﴿ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ

﴿يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ ﴾(الأنعام: ٥٢). مانای ئەوەیە: كۆمەڵێك دوورمەخەرەوە كە بە شەو لە ماڵی خوادا بە ڕۆژیش لە دەرگای خوادا دەپاڕێنەوە، خەڵكێك دوور مەخەرەوە كە مزگەوت پەناگەیانەو خوای گەورە مەبەستیانە، خواردنیان تەنها برسێتی و شەونخوونیە، هەژاری و نەداری دروشمیانە، شەرم وشكۆ بەرنامەیانە ئەسپی سووربونیان لەبەر دەرگای پەروەردگاریاندا بەستوەتەوە ، پاڕانەوەو ڕووگەیان دوعایە، هەژاری دوو جۆرە: گشتی و تایبەتی، گشتی:بریتیە لەو پیاهەڵدانەی كە هەموو دروستكراوەكان لە باوەڕدارو بێ باوەڕ پێویستیان بە خودا هەیە ئەمەش مانای ئەو دەقەیە كە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴾ (فاطر: ١٥). واتە: ئەی خەڵكینە ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە موحتاجی خوان،(لە هەموو كات و شوێنێكدا و بۆ هەموو شتێك ) هەر تەنها خوایە بێ نیازەو شایانی سوپاسە. وە تایبەتی: پیاهەڵدانێكە بۆ دۆست و خۆشەویستەكانی خوا كە دەستیان هەڵگرتووە لە دونیاو دڵیان لای نەماوە تەنها سەرقاڵیان كردووە بە بەندایەتی و خۆشەویستی خوای گەورەوە وە بیركردنەوە لە دروستكراوەكانی .

# تاوانی پەنجاو پێنج
## درێژکردنی جل و بەرگ و شەڕواڵ بە مەبەستی شانازی و لە خۆبایی بوون و لووت بەرزی

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :( ما أسْفَلَ من الْكَعْبَيْنِ من الْإِزَارِ فَفِي النَّارِ )[1].
واتە :هەر بەرگێ لەبەر مرۆڤدا لە دوو قوله‌پێ دابەزێ ئەوە دەکەوێتە ئاگری دۆزەخەوە.

وەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (لَا يَنْظُرُ الله يوم الْقِيَامَةِ إلى من جَرَّ إِزَارَهُ بَطَرًا)ﷺ .
واتە: خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا تەماشای کەسێك ناکات دەرقاچەی درێژ بێت بە مەبەستی لە خۆبایبوون.

لە(أبو ذر)ەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:( قال ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ الله يوم الْقِيَامَةِ ولا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ ولا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمُسْبِلُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ).
واتە: سێ کەس خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا نە قسەیان لەگەڵدا دەکات و نە پاکیان دەکاتەوە و لە ڕۆژی دواییدا سزایەکی بە ئێشیان بۆ دەبێت: ئەوکەسەی کە دەرقاچەکەی درێژە، ئەوکەسەی کە منەت دەکات بەسەر خەڵکیدا، ئەو کەسەی کاڵاکەی دەفرۆشێت بەڵام بە سوێندی درۆ ).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي فِي حُلَّةٍ تُعْجِبُهُ نَفْسُهُ مُرَجِّلٌ جُمَّتَهُ إِذْ خَسَفَ الله بِهِ فَهُوَ يَتَجَلْجَلُ إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ)ﷺ . واتە: لە کاتێکدا پیاوێك بە ڕێگەدا دەڕۆشت جلێکی درێژی لەبەردا بوو، شانازی بەخۆیەوە دەکرد و ملی بەرز کردبوو، خوای گەورە بردی بەناخی زەویدا هەتا ڕۆژی دوایی.

[1] – البخاري(٥٧٨٧).

ئەو فەرموودەیە گشتیە دەربارەی لە پێکردنی شەڕواڵ و جل وبەرگ و جوبەو هاوشێوەكانی.

كاتێك كە فەرمووی: (من جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لم يَنْظُرْ الله إليه يوم الْقِيَامَةِ) واتە: هەركەس جل و بەرگی شۆربێ و بەسەر زەویدا لەبەر فیزو لە خۆبایی بوون بكشێ، خوا لەڕۆژی دواییدا سەیری ناكات. لێرەدا (أبو بكر) وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ من لایەكی دشداشەكەم شۆڕ دەبێتەوە، مەگەر هەمیشە ئاگام لێ بێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّكَ لَسْتَ تَصْنَعُ ذلك خُيَلَاءَ). واتە: تۆ لەبەر فیز و خۆبەزل زانین ئەوە ناكەیت[٢].

---

[٢] – البخاري(٦٠١٤)، ومسلم(٢٦٢٤).

# تاوانی پەنجاو شەش

## پۆشینی ئاوریشم و ئاڵتوون بۆ پیاوان

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَا يُلْبَسُ الْحَرِيرُ فِي الدُّنْيَا إلا لم يُلْبَسْ منه شيء في الْآخِرَةِ)[1]. واتە: هەرکەس ئاوریشم لە دونیادا بپۆشێت ئەوا لە قیامەتدا ناپۆشێت،

لە(حذيفة)ی کوڕی( يمان) ەوە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ قەدەغەی کردووە لە دەفری زێڕو زیودا ئاو بخۆینەوە، یا خۆراك بخۆین.هەروەها لەبەرکردنی جلوبەرگی ئاوریشم ودێباجی لێ قەغە کردووین، هەروەها دانیشتنی لەسەر ئەو شتانە لێ قەدەغە کردووین[2]

هەرکەسێ بڵێ ئاوریشم حەڵاڵە کافر دەبێت ،تەنیا بۆ نەخۆشی خروشت و گڕوپەتی ڕێ پێدراوە ، هەروەها بۆجەنگاوەری موسڵمان لەکاتی شەڕدا.

بەڵام لەبەرکردنی ئاوریشم بۆ جوانی لە پیاوان قەدەغەیە بە کۆ دەنگی زانایان.وە بەهەمان شێوە ئەگەر ئەو جل وبەرگە زۆربەی ئاوریشم بوو ئەوە حەرامە، بەهەمان شێوە پۆشینی ئاڵتوون بۆ پیاوان حەرامە ، ئەگەر ئەنگوستیلە بێ یا قایش یان دەسکی شمشێر. پێغەمبەری خواﷺ لە دەستی پیاوێکدا ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتوونی بینی لە دەستی داکەندو فەرمووی: (يَعْمِدُ أحدكم إلى جَمْرَةٍ من نَارٍ فَيَجْعَلُهَا في يَدِهِ )[3] .واتە: کەسێك لە ئێوە بە ئەنقەست پەنا دەبا بۆ خەڵووزێکی ئاگری ئینجا دەیکاتە دەستی.

زانایان ڕاو بۆچوونی جیاوازیان هەیە دەربارەی پۆشینی ئاوریشم و ئاڵتون بۆ منداڵ (کوڕ)، هەندێکیان ڕێگەیان پێ داوە و هەندێکی تر ڕێگەی پێ نەداوە.

---

[1] – البخاري(٨٥٣٢)، ومسلم(٢٠٦٩).

[2] – البخاري(٨٥٣٧).

[3] – مسلم(٢٠٩٠).

# تاوانی پەنجاو حەوت

## یاخیبوونی کۆیلە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا أَبَقَ الْعَبْدُ لم تُقْبَلْ له صَلَاةٌ)[1]. واتە: ئەگەر کۆیلەیەك یاخی ببێ نوێژی لێ وەرناگیرێت.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَيُّمَا عَبْدٍ أَبَقَ فَقَدْ بَرِئَتْ منه الذِّمَّةُ)[2]. واتە: هەر کۆیلەیەك یاخی ببێ ئەوە هیچ زەمانەتێکی بۆ نیە.

له (فضالة)ی کوڕی( عبید ) ەوە بە (مرفوع)ی هاتووە: (لاَ تَسْأَلْ عَنْهُمْ رَجُلٌ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ وَعَصَى أمامه وَمَاتَ عَاصِياً وَأَمَةٌ أو عَبْدٌ أَبَقَ فَمَاتَ وَامْرَأَةٌ غَابَ عنها زَوْجُهَا قد كَفَاهَا مُؤْنَةَ الدُّنْيَا فَتَبَرَّجَتْ بَعْدَهُ)[3]. واتە: سێ کەس پرسیاریان لێ ناکرێت: کەسێك لە کۆمەڵی موسڵمانان جیا بێتەوە وسەرپێچی پێشەواکەی بکات و بەو سەرپێچیەش کۆچی دوایی بکات، وە کۆیلەیەکی یاخی بوو و ئافرەتێك پیاوەکەی دیار نەبێ یا لەسەفەر بێت و پێداویستیەکانی بۆی بە جێهێشتبێ ئینجا ئەو خۆی جوان بکات یا خۆی برازێنێتەوە.

---

[1] – مسلم(٧٠).

[2] – مسلم(٦٩).

[3] – مسند أحمد بن حنبل ج٦/ص١٩، والحاكم ١ \ ١١٩، وإسناده حسن كما في المسند .

## تاوانی پەنجاو هەشت

## سەربڕین لە پێناو غەیری خوای گەورەدا

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ (الأنعام: ١٢١).
واتە: لەو ئاژەڵە سەربڕاوانەش مەخۆن کە لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی خوای لەسەر نەبراوە، ئیبن عەباس دەڵی : مەبەست لەم ئایەتە ،مردارە وە بوو خنکێنراو .

﴿ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ﴾(الأنعام: ١٢١). واتە: بەڕاستی ئەوە لادان و گوناهە: ﴿ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾(الأنعام: ١٢١).واتە :دڵنیابن کە شەیتانەکان شت دەخەنە دڵی لایەنگرەکانیانەوە تا موجادەلەتان لەگەڵ بکەن ( بەرگری لە بەتاڵیان بکەن ) جا ئەگەر ئێوە فەرمانبەرداری ئەو هاوەڵگەرو شەیتانانە بن ،ئەوە بێگومان مانای وایە ئێوەش موشریك و هاوەڵگەرن (موشریك).

(الزجاج) دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر موسڵمانێك شتێك حەرام بکات کە خوای گەورە حەلاڵی کردووە، یان شتێك حەلاڵ بکات کە خوای گەورە حەرامی کردووە ئەوە موشریکە.

ئەگەر بوترێت: چۆن سەربڕاوی موسڵمان حەلاڵە کەناوی خوای گەورەی تێیدا نەهێنابێت، ئایەتەکەیش وەك دەقێکە لەسەر ئەوە ؟

دەڵێم: موفەسیرین و ڕاڤەزانانی قورئان ئایەتی: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ بە مردارەوە بوو ڕاڤەیان کردووە، وە هیچ زانایەك لەسەر ئەوە ڕاڤەی نەکردووە کە موسڵمان لە کاتی ئاژەڵ و باڵندە سەربڕیندا ناوی خوای گەورەی نەهێنێت، لە دەقەکەشدا بەڵگەی زۆر هەیە کە مەبەستی مردارەوە بوو بووە.

لەوانه دەڤی:﴿ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ﴾. تاوانبار نابێت كه سێك كه له گۆشتی ئاژەڵی سەربڕاوی موسڵمانێك بخوات كه ناوی خوای لەسەر نەهێناوە.

وەهەروەها دەڤی: ﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَـٰدِلُوكُمْ ﴾لێرەدا مەبەست له مردارەوە بووە بە یەك دەنگی ڕاڤەزانان نەك له سەربڕاوی موسڵمانان كه ناوی خوای گەورەی لەسەر نەهاتبێ.

هەروەها دەڤی:﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾ شیرك له حەلاڵ كردنی مردارەوە بووە نەك حەلاڵ كردنی سەربڕاوێك ناوی خوای لەسەر نەهێنرابێت.

لة ( عائشة) ڕەزای خودای لێبێت دەڵێت: خەڵكێك وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵكانێك گۆشتمان بۆ دەهێنن نازانین ئایا ناوی خوای لەسەر هێنراوە یان نا ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە ناوی خوای لەسەر بهێنن و بیخۆن[1].

[1] – البخاري(٢٠٥٧).

## تاوانی پەنجاو نۆ

## دەربارەی کەسێك بەناو جگە لە باوکی خۆیەوە بانگ بکرێت وخۆی بزانێت

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من ادَّعَى إلى غَيْرِ أبيه وهو يَعْلَمُ فَالْجَنَّةُ عليه حَرَامٌ)[1]. واتە: ئەوەی خۆی بە کوڕی غەیری باوکی بناسێنی، لەکاتێکدا بزانێت وانییە، ئەوە بەهەشت لەسەری قەدەغەیە.

لە (أبو هريرة) وە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَا تَرْغَبُوا عن آبَائِكُمْ فَمَنْ رَغِبَ عن أبيه فَهُوَ كُفْرٌ)[2]. واتە: پشت مەکەنە باوباپیرانتان، چونکە هەرکەس پشت هەڵکات لەباوکی و حاشای لێ بکات، بەوە کافر دەبێت.

پێغەمبەری نازدارﷺ فەرموویەتی: (وَمَنْ ادَّعَى إلى غَيْرِ أبيه أو انْتَمَى إلى غَيْرِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)[3]. واتە: ئەوەی خۆی بە کوڕی غەیری باوکی بناسێنی،یا خۆی بداتە پاڵ جگە لە هۆزەکەی خۆی، ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لێ بێت.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (الْمَدِينَةُ حَرَامٌ ما بين عَائِرٍ إلى كَذَا فَمَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا أو آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لَا يُقْبَلُ منه عَدْلٌ ولا صَرْفٌ وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ يَسْعَى بها أَدْنَاهُمْ فَمَنْ أَخْفَرَ مُسْلِمًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لَا يُقْبَلُ منه صَرْفٌ ولا عَدْلٌ وَمَنْ والي قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ

---

[1] – البخاري(٦٧٦٦).

[2] – البخاري(٦٧٦٧).

[3] – مسلم(١٣٧٠).

وَالْمَلَائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ لَا يُقْبَلُ منه صَرْفٌ ولا عَدْلٌ)[٤]. واته: مەدینه حەرام و قەدەغەیه له فلآن شوێنەوه بۆ فلآن شوێن، هەرکەسێك خراپەکاریەکی تێدا بکات یان پەنای خراپەکاری تێدا بدات، ئەوه نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لیٚ بێت خوا هیچ پەرستش و عیبادەتێکی نه فەرزو نه سووننەتی لیٚ وەرناگرێت .

هەروەها فەرموویەتی: ئەستۆی موسڵمانان هەمووی وەکویەکه (واتا موسڵمانان به بیٚ جیاوازی هەریەکەیان ئەتوانی پەنای کەسی بێگانه بدات با بیٚ باوەڕیش بێت کەسێکیش که موسڵمانێك پەنای دا ئیتر نابێت کەس دەستدرێژی بکاته سەر) هەرکەسێکیش موسڵمانێك ڕووبەڕووی مەترسی بکاتەوه وغەدری لیٚ بکات و بەڵێنی خۆی لەگەڵدا نەباته سەر ئەوه نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لیٚ بێت، نه پەرستن و نه عیبادەتی فەرزو سووننەتی لیٚ وەرناگیرێت. هەرکەسێکیش خۆی بداته پاڵ هۆزێك جگه له هۆزەکەی خۆی وه پشتیوانیان لیٚ بکات ئەوه نەفرینی خواو فریشتەکان و هەموو خەڵکی لیٚ بێت، خوا هیچ پەرستش و عیبادەتێکی لیٚ وەرناگرێت نه فەرزو نه سووننەت.

[٤] – البخاري(٣١٧٩).

# تاوانی شەست

## دەمەقرێ و مشت و مڕوو دژایەتی کردن

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُۥ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيُشْهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِى قَلْبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيهَا وَيُهْلِكَ ٱلْحَرْثَ وَٱلنَّسْلَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْفَسَادَ ﴾(البقرة: ٢٠٤، ٢٠٥). واتە: هەندی کەس قسەو گوفتارو و دەم پاراوییان لەبارەی ژیانی ئەم دونیایەوە سەرسامت دەکات، خوایش بەشایەت دەگرێت و دەڵێت: دڵ و زمانم یەکسانن، لە کاتێکدا ئەو سەرسەختترین کەسە لەهەموو جۆرە دوژمنایەتیەکدا. هەرکاتێك ئەو جۆرە کەسە پشتی هەڵکردو دەسەڵاتی پەیدا کرد، هەوڵ و کۆشش دەدات لە زەویدا تا ئاشوب بەرپا بکات و خراپە بروێنێت و کشتوکاڵ لەناو ببات و پاکتاوکردنی ڕەگەزی ئەنجام بدات، بێگومان خوا فەسادو خراپەو تاوانی خۆش ناوێت.

ئیمامی غەزالی دەربارەی مانای (المراء) دەڵێت: تانە دانە لەقسەی کەسی بەرامبەر بەدەرهێنانی خەوش و نەنگیەك لە قسەکانیدا ،بەبێ ئەوەی هیچ مەبەستێکی هەبێت جگە لەوە نەبێ کە کەسی بەرامبەری پێ کەم بکاتەوە.

وە (الجدال): دەستەواژەیەکە بۆ فەرمانێك پەیوەندی هەیە بە دەرخستنی ڕاو بۆچوونەوە .

وە (الخصومة): سووربوون و پێداگرتنە لە قسەیەکدا مەبەست پێی بەدەست هێنانی ماڵێکە یا مافێکی ڕەوا، ئەوەش جارێك بەسەرەتا دەست پێدەکات، یا ڕەخنەگرتن و بەهانە هێنانەوە.

ئیمامی (النووی) دەڵێت: بزانە هەندێ جار (الجدال) حەق و ڕاستە و، هەندێ جار بەتاڵ و ناڕاستە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُجَـٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَـٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَـٰهُنَا وَإِلَـٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ﴾(العنكبوت: ٤٦). واتە: گفتوگۆ ( مجادلة ) مەکەن لەگەڵ خاوەنی کتێبە ئاسمانیەکاندا مەگەر بەجوانترین شێوە نەبێت، جگە لەوانەیان کە ستەمیان کردووە ( ئەوە ڕەفتارتان لە بەرامبەریانەوە دەبێت جیاواز بێت ) پێشیان بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی بۆ ئێمە و ئێوە دابەزێنراوە، خوای ئێمەو خوای ئێوە تەنها یەکێکە، ئێمە فەرمانبەرداری ئەو زاتەین.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَجَـٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾( النحل: ١٢٥). واتە: ( ئەی پێغەمبەرﷺ ( ئەی ئیماندار گفتوگۆ و موجادەلە بەجوانترین شێوە بکە ( لەگەڵ هەندێکی تردا بە تایبەت خاوەن کتێبەکان ).

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَا يُجَـٰدِلُ فِيٓ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَـٰدِ﴾(غافر: ٤). واتە: هیچ کەس لە بەرامبەری ئایەت و فەرمانەکانی خواوە موجادەلەو دەمەدەمێ ناکات، جگە لەوانەی کە بێ بڕواو خوا نەناس بوون، ئەی پێغەمبەر ﷺ کەواتە دەسەڵات و سەرمایە و فریوت نەدات.

پاشان دەڵێت: ئەگەر مشتوو مڕ (الجدال) بۆ وەستان لەسەر حەق و ڕاستی بێت، ئەوە کارێکی باش و پەسەندە، وە ئەگەر بۆ ڕێگرتن لە دەرخستنی ڕاستی یا بەبێ زانست ئەوە سەرزەنشت کراوە، کەواتە لەسەر ئەم تێرو تەسەلییە ئایەتەکان کە هاتوون جارێك بە سەرزەنشت کردن، جارێکی تر بە ئاسایی و بەبێ سەرزەنشتکردنی .

هەروەها دەچێتە ناو سەرزەنشتکردنەوە ئەگەر کەسێك داوای مافی خۆی بکات،لە ڕێگەی درۆکردن و ئازاردان و سەرزەنشتکردنی کەسی بەرامبەر بەشێوەیەکی نا تەندروست.

بەهەمان شێوە ئازاردانی نەیار بە بەکار هێنانی وتەی زبرو ناشیرین و قیزەون.

بەهەمان شێوە لەکاتی مشتومڕ کردندا بەکارهێنانی سەرکێشی و یاخی بوون بۆ ناچارکردنی نەیار ئەمەش سەرزەنشت کراوە.

بەڵام ستەم لێکراو ئەگەر مشتومڕی کرد لە ڕێگەیەکی شەرعی و بەبێ وتەی زبرو سووربوون و ئازاردان و ......هتد،و مافی خۆی بەدەست هێنا، ئەوە حەرام نیە، بەڵام واباشترە تا ئەتوانێت خۆی بەدوور بگرێت لە مشتومڕی ئەگەر ڕێگەیەکی باشتری بەدی کرد، چونکە پاراستنی زمان ئەرکە و واجبە لە بەرامبەر نەیاردا تەنانەت ئەگەر بەمیانڕەویش بێت(.

عاجز بوون و تورەیی وای لێ دێت ڕق و قینە دروست بێت، هەردوولا حەز بە ئازاردان و ناخۆشی ئەویتر دەکات

جا کەمترینی پاشماوەی مشتومڕ وا لەدڵ دەکات کە لەکاتی نوێژ کردنیشدا بیر لە دەرئەنجامی ئەو کارە بکاتەوە، بۆیە ناتوانێت بەردەوام بێت لە سەر ئەو دۆخە چونکە نەیاریکردن خراپترین ڕێبازە، بەهەمان شێوە مشتومڕی کردن و دەمەقاڵێ، بۆیە پێویستە لەسەر مرۆڤ دەرگای مشتومڕ دابخات بە سەر خۆید، مەگەر بۆ پێویستی یەکی زۆر گرنگ نەبێت.

## بــەش

لەکاتی قسەکردندا باش نیە زۆر لەخۆکردن بە بەکارهێنانی وشەی بریق باق و دەم پانەوە کردن و ڕستەی ڕەوان بێژی و زمان سوڕدان، وەك چۆن هەندێ لە ڕەوان بێژان کردوویانە بە پیشە، ئەمانە هەمووی سەرزەنشت کراوە، بەڵکو وا پێویستە لەکاتی قسەکردندا مرۆڤ بەخاکی بدوێت و وشەیەك بەکار بهێنێت کە ڕوون و ڕەوان بێت تا هەموو چین و توێژێك لێی تێبگەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ يَبْغَضُ الْبَلِيغَ من الرِّجَالِ الذي يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ كما تَتَخَلَّلُ الْبَقَرَةُ)[1]. واتە: بەڕاستی خوای گەورە ڕقی لەو ڕەوان بێژانەیە لە پیاوان کە لە کاتی قسەکردندا زمانی با دەدات وەك چۆن مانگا زمانی با دەدات.

بزانە باش قسەکردن و دەرخستنی پیتەکان بەجوانی بۆ وتار بێژ و بانگ خواز ناچێتە چوار چێوەی سەرزەنشت کردنەوە ئەگەر ڕۆچوون و سەرنج ڕاکێشی تێدا نەبێت، مەگەر بۆ ئەوە نەبێ تەنها مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی خەڵك بێ بۆ لای خوای گەورە، بەخۆشبەختییەوە لەمەدا شوێنەوارێکی باش بەدی دەکرێت.

---

[1] – الترمذي(٣٢٥٣)، وصححه الشيخ الألباني .

# تاوانی شەست و یەك

## ڕێگری کردن لە ئاوی زیادە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍ ﴾( الملك: ٣٠ ). واتە: پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ باشە ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو، کێ دەتوانێت ئاوی سازگارو ڕەوانتان بۆ بەدەست بهێنێت؟! ( جگە لە خوای میهرەبان ).

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَا يُمْنَعُ فَضْلُ الْمَاءِ لِيُمْنَعَ بِهِ فَضْلُ الكلأ)[1]. واتە: ئاوی زیادە نابێت لەکەس قەدەغە بکرێت، نەبادا بەو بیانووەوە لە وەرگاش قەدەغە بکرێت.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ( ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ الله يوم الْقِيَامَةِ ولا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ: رَجُلٌ حَلَفَ على سِلْعَةٍ لقد أَعْطَى بها أَكْثَرَ مِمَّا أَعْطَى وهو كَاذِبٌ، وَرَجُلٌ حَلَفَ على يَمِينٍ كَاذِبَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ لِيَقْتَطِعَ بها مَالَ رَجُلٍ مُسْلِمٍ، وَرَجُلٌ مَنَعَ فَضْلَ مَاءٍ فيقول الله الْيَوْمَ أَمْنَعُكَ فَضْلِي كما مَنَعْتَ فَضْلَ ما لم تَعْمَلْ يَدَاكَ)[2]. واتە: سێ کەس هەن خوا لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵ ناکات و بەچاوی (ڕەحمەت) تەماشایان ناکات. پیاوێك سوێند بخوات لەسەر کوتاڵ و شمەکێك کە گوایە زیاتری پێداوە لەو نرخەی کە کڕیار دەیداتێ بە درۆوە، پیاوێکیش پاش عەسر سوێندێکی درۆ بخوات بۆ ئەوەی ماڵی پیاوێکی موسڵمانی پێ داگیر بکات. پیاوێکیش ئاوێکی زیاد لە پێویستی خۆی هەبێت و لەخەڵکی بگرێتەوە. (لە ڕۆژی دواییدا) خوا دەفەرموێ پێی: منیش ئەمڕۆ خێرو بەخششی خۆمت لێ دەگرمەوە وەك چۆن تۆ ( لە دونیادا) ئەو زیادەیەت لە خەڵکی دەگرتەوە کە لە بنەڕەتدا خۆت بەدیت نەهێنابوو.

---

[1] – البخاري( ٦٩٦٢)، ومسلم(١٥٦٦).

[2] – البخاري( ٢٣٥٨)، ومسلم(١٠٨).

# تاوانی شەست و دوو

## تەرازوو بازیی و كەم كردن لە پێوانەو هاوشێوەی ئەوانە

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ۝١ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ۝٢ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ۝٣ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ﴾( المطففين:١، ٤). واتە: هاوارو ئاهو ناڵە بۆ تەرازووبازەكان، بۆ ئەوانەی كە لە كێشان و پێواندا لە كڕین و فرۆشتندا تەرازووبازی و فێڵ دەكەن( یان لە هەڵسەنگاندنی خەڵكیدا ڕاست ناڵێن ). ئەوانەی كاتێك شت لەخەڵكی دەكڕن بە تەواوی، بە زیادەوە لێیان وەردەگرن. بەڵام كاتێك شتیان بۆ دەپێون یان دەكێشن لێی دەدزنەوەو كەمیان دەدەنێ و فێڵی لێدەكەن. ئایە ئەوانە گومان نابەن كە بەڕاستی زیندوو دەكرێنەوە ( تا سەرئەنجامی خیانەت و فێڵیان وەربگرن ).

( السدي ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا كاتێك كە هاتە مەدینە پیاوێكی لێ بوو پێی دەوترا : ( أبو جهينة ) دوو پیوانەی هەبوو كێشانەی بە یەكێكیان دەكرد و بەوی تریان زەرەری دەدا لە خەڵك خوای گەورە ئەم ئایەتەی داگرتە خوارەوە ﴿ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ﴾[1].

( الزجاج ) دەڵێت: واتە: ئەگەر بزانن زیندوو دەكرێنەوە هەرگیز فێڵ ناكەن لە كێشانەو پێوانەدا.﴿ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴾ڕۆژی دوایی، ﴿ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ ﴾ لە گۆڕەكانیاندا ﴿ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ (المطففين: ٤-٦). لە فەرمانی خوای گەورەو پاداشتی و لێپرسینەوەی، هەموویان بۆ یەكلا كردنەوەی كەیسەكانیان لە خزمەتی خوای گەورەدا دەوەستن.

---

١ - أسباب النزول للواحدي ص ٢٥٩ .

(المطفف): ئەکەسەیە کە لە کیشانەو پێوانەدا دادپەروەری ناکات و لێی کەم دەکات، هەر لەبەر ئەوەیە بەو شێوە ناو نراوە چونکە دزی دەکات تەنانەت کەمیش بێت، ئەوەش جۆرێکی ترە لە دزی و خیانەت و خواردنی ماڵی حەرام و قەدەغەکراو.

پاشان خوای گەورە پەیمانی داوە بەو کەسەی کە ئەو کارە ئەنجام دەدات بە سزایەکی قورس و بەئێش، یا بە شیوێکی دۆزەخ ئەگەر هەموو کێوەکانی دونیا بترازیتە ناویەوە، بەهۆی گەرمییەوە دەتوێتەوە.

(نافع) دەڵێت: ( ابن عمر) کاتێك کە بەلای فرۆشیارێکدا تێدەپەڕی دەیفەرموو: لە خوا بترسە و دادپەروەر بە لە پێوانەو کیشانەدا، چونکە تەرازوو بازان دەوەستێنرێن، هەتا ئارەق تا گوێچکەیان دادەپۆشێ، بەهەمان شێوە ئەو بازرگانەی کە لە کاتی فرۆشتندا دەستی توند دەگرێت و لەکاتی کڕیندا شل دەگرێت.

هەندی لە زانایانی پێشین وتویانە: وای بۆ ئەو کەسەی کە شتێك دەکڕێت و بە ناتەواوی دیفرۆشێت، قوڕ بەسەر ئەو کەسەی دۆزەخ دەکڕێت بە دەنکە گەنمێك کاتێك زیادەی لەسەر وەردەگرێت.

# تاوانی شەست و سێ

## بێ باك بوون لە سزاو تووڕەیی خوای گەورە

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذْنَٰهُم بَغْتَةً ﴾(الأنعام: ٤٤). واتە: هەتا کاتێك کە دڵخۆش و شادمان بوون بەوەی کە پێیان درا، ئیتر لەناکاو گرتمانن و هەموویانمان سەرگەردان و ڕیسواکرد.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حتى ما يَكُونُ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُ إلا ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عليه الْكِتَابُ فَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا)[1]. واتە: لە ڕاستیدا کەسی واتان هەیە بەلای خەڵکەوە وایە کە کرداری خەڵکی دۆزەخ دەکات، هەتا نێوانی ئەوو دۆزەخ تەنها گەزێکی دەمێنێت، ئینجا کتێبەکەی پێش دەکەوێت و کرداری خەڵکی بەهەشت دەکات و دەچێتە بەهەشتەوە.

وە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّهُ من أَهْلِ الْجَنَّةِ وَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنَّهُ من أَهْلِ النَّارِ الْأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ)[2]. واتە: لە ڕاستیدا کەسی واتان هەیە بەلای خەڵکەوە وایە کە کرداری خەڵکی دۆزەخ دەکات، بەڵام ئەو لە خەڵکی بەهەشتە، وە هی واتان هەیە بەلای خەڵکەوە وایە کە کرداری خەڵکی بەهەشت دەکات، بێگومان لە خەڵکی دۆزەخە، کردارەکان بە سەرنجام و کۆتایی یە.

---

[1] – البخاري(٣٢٠٨)، ومسلم(٢٦٤٣).

[2] – البخاري(٦٤٩٣)، ومسلم(٢٦٥١).

له (سالم)ی كوڕی(عبد الله) ەوه دەڵێت: زۆر جار پێغەمبەری خواﷺ دوعای دەكرد دەیفەرموو (لَا وَمُقَلِّبِ القُلُوبِ)[٣]. واته: ئەی ئەو زاتەی دڵەكان ئەم دیو و ئەودیو دەكات و وەریان دەگێڕێت.

له قورئاندا هاتووه خوای گەوره دەفەرموێت:﴿ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴾(الأنفال: ٢٤). واته: چاك بزانن بەڕاستی خوا ( زۆر بەئاسانی ) دەتوانێت بكەوێتە نێوان ئادەمیزاد و ئاواتی )دڵیەوه ( بەگۆڕینیان )، ( بیرتان نەچێت ) بەڕاستی هەر بۆ لای ئەویش كۆ دەكرێنەوه.

ئیمامی( الطبري) دەڵێت: ئەم ئایەته بەڵگەیه لەسەر ئەوەی كه دڵی بەندەكان بەدەستی خوای گەورەیه، بەویستی خۆیەتی و دەسەڵاتی هەیه بەسەر دڵەكانەوه ئەگەر بیەوێت، هەتا هیچ دڵێك هەست به هیچ نەكات بەبێ ویستی خۆی.

جا ئەگەر هیدایەت و ڕێنومایی ناسراو بوو، پابەندبوون لەسەر ویستی خوای گەورەبوو، داهاتووش نادیار و خواستەكان له ژێر فەرمانی خوای گەوره بوو، كەواته هیچ مەنازه به ئیمان و كردەوه و نوێژو ڕۆژوو هەموو كاره چاكەكانتەوه، تەنانەت ئەگەر بەكۆششی خۆتیش بێت، چونكه ئەوه فەزڵی خوای گەورەیه له دونیایەدا لەسەر تۆ.

هەركات كه شانازی بكەیت بەو شتانەوه، ئەوه به شتی جگه له هی خۆت شانازیت كردووه، لەوەیه لێت وەربگرێتەوه، پاشان بگەڕێیتەوه بۆ دۆخی جاران كه دڵت بۆش و بەتاڵ بێت.

## ئامۆژگاری

ئەی نەوەی ئادەم، قەڵەمەكان بەسرتەوه تێپەڕ دەبن، بەڵام تۆ له بێ ئاگاییدای! ئەی نەوەی ئادەم، واز بێنه له گۆرانی و سەما و، كۆشك و تەلار، هەتا بتوانێت ئەوەی دەیكەیت كەڵكی لێ وەربگریت.

---

[٣] – البخاري(٦٦٢٨).

# تاوانی شەست و چوار

## نائومێدی و بێ هیوایی لە ڕەحمەتی خوای گەورە

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُۥ لَا يَاْيْـَٔسُ مِن رَّوْحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ (یوسف: ٨٧). واتە: بەڕاستی کەس نائومێد نابێت لە سۆزو میهرەبانی خوا جگە لە کەسانی خوانەناس و بێ باوەر.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟﴾(الشوری: ٢٨). واتە: خوا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێت و دەیگەیەنێتە فریایان دوای ئەوەی کە نائومێد بوون.

وەخوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ﴾(الزمر: ٥٣). واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خوا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم... ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووە و هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا.

پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (لَا يَمُوتَنَّ أحدكم إلا وهو يُحْسِنُ بِاللَّهِ الظَّنَّ)[١]. واتە: با کەسێك لە ئێوە نەمرێت ئیللا گومانی چاکی هەبێت بە خوای گەورە.

### ئامۆژگاری

خوایە گیان ئەگەر خۆشەویستیت بۆ لێخۆش بوون نەبوایە، ڕێگەت نەئەدا تاوانبار بەسەر زەویدا بگەڕێت، ئەگەر لێخۆش بوون و سۆزت نەبوایە باخچەکانی بەهەشت کەسی تیدا نیشتەجێ نەدەبوو.

---

[١] - مسلم(٢٨٧٧).

خوایە گیان تۆ لێخۆشبووو و میهرەبانیت حەزت لە لێخۆش بوونە لێم خۆش بە .

خوایە گیان بە چاوی ڕەحمەت تەماشامان بکەو، لە خەڵکی پاك و پاراو بمان ژمێرە، وە دوورمان بکەرەوە لە تاوان و گوناە .

# تـاوانی شەست و پێنج

## وازهێنان له نوێژ بەكۆمەڵ وئه نجامدانی به تەنها بەبێ بیانوو

له (أبو هريرة) وه دەڵێت: پێغەمبەرﷺ به كۆمەڵێكی فەرموو كه نه دەهاتن بۆ نوێژی به كۆمەڵ: (وَالَّذِي نَفْسِي بيده لقد هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِحَطَبٍ فَيُحْطَبَ ثُمَّ آمُرَ بِالصَّلَاةِ فَيُؤَذَّنَ لها ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا فَيَؤُمَّ الناس ثُمَّ أُخَالِفَ إلى رِجَالٍ فَأُحَرِّقَ عليهم بُيُوتَهُمْ)[1]. واته: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە، له خولیامدا بوو فەرمان بكەم دارم بۆ بهێنن، ئینجا فەرمان بكەم بانگ بدرێت بۆ نوێژ، ئینجا فەرمان بكەم به پیاوێك پێشنوێژی بكات، ئینجا لەگەڵ چەند پیاوێكدا برۆین ماڵی ئەوانه بسوتێنم بەسەریاندا (كه نایەن بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت).

وه پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عن وَدْعِهِمْ الْجُمُعَاتِ أو لَيَخْتِمَنَّ الله على قُلُوبِهِمْ ثُمَّ لَيَكُونُنَّ من الْغَافِلِينَ)[2]. واته: ئەو خەڵكانەی واز له كردنی نوێژی هەینی دەهێنن یا خوای گەوره مۆر بدات بەسەر دڵەكانیاندا، پاشان ببن بەوكەسانەی كه بێ ئاگان.

له(حفصة) وه دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (رَوَاحُ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ)[3]. واته: ڕۆیشتن بۆ نوێژی هەینی ئەركەو واجبه لەسەر هەموو كەسێكی پێگەیشتوو.

---

[1] – البخاري(٦٤٤)، ومسلم( ٦٥١).

[2] – مسلم( ٨٦٥).

[3] – أبو داود(٣٤٢)، وصححه الشيخ الألباني.

# تـاوانی شەست و شەش

## بەردەوام بوون لەسەر وازهێنان لە نوێژی بەكۆمەڵ بەبێ بیانوو

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾ خَٰشِعَةً أَبْصَٰرُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ۖ وَقَدْ كَانُوا۟ يُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمْ سَٰلِمُونَ ﴾(القلم: ٤٢- ٤٣). واتە: ڕۆژێك دێت پەردە لەسەر هەموو شتێك لادەبرێت و لاق دەردەكەوێت، خوا نەناسەكان بانگ دەكرێن بۆ سوژدە بردن،بەلآم ناتوانن.ئەوانە،ئەو ڕۆژە چاویان شۆڕەو زەلیل و خەجاڵەتی بە تەواوی دایان دەگرێت،چونكە كاتی خۆی بانگ ئەكران بۆ نوێژ كردن و سوژدە بردن لە كاتێكدا لەو پەڕی تەندروستی و سەربەستیدا بوون( بەلآم گاڵتەیان پێ دەهات ) .

(كعب الأحبار) دەڵێت: ئەم ئایەتە دانەبەزیوە ئیللا دەربارەی ئەوانە نەبێت كە لە نوێژە بەكۆمەڵەكان دوا دەكەوتن.

(سعيد)ی كوڕی(المسيب ) دەڵێت: مەبەستی ئەوكەسانەیە كاتێك گوێیان لە ( حي على الصلاة، حي على الفلاح) دەبوو وەلآمیان نەئەدایەوە بە هاتنیان بۆ نوێژی بەكۆمەڵ لەكاتێكدا لەشیان ساغ و سەلامەت بوون.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: لقد هممت أن امر بالصلاة فتقام، ثم امر رجلاً فيصلي بالناس، ثم أنطلق برجال معهم حزم من حطب إلى قوم لا يشهدون الصلاة في جماعة فأحرق بيوتهم عليهم بالنار[1].

واتە: لە خوولیامدا بوو فەرمان بكەم بە دابەستنی نوێژ، پاشان فەرمان بكەم بەكەسێك پێشنوێژی بكات، ئینجا لەگەڵ چەند پیاوێكدا بڕۆین بە چارۆكە دارەوە بۆ لای

[1] – البخاري(٦٤٤)، ومسلم( ٦٥١).

ئەوكەسانه كه ئامادەی نوێژی به كۆمەڵ نابن، ماڵەكانیان بسوتێنین بەسەریاندا( كەنایەن بۆ مزگەوت ) .

له ڕیوایەتی مووسلیمدا له (أبو هريرة) وه بەم شێوه هاتووه: (لقد هَمَمْتُ أنْ آمُرَ فِتْيَانِي أنْ يَسْتَعِدُّوا لي بِحُزَمٍ من حَطَبٍ ثُمَّ آمُرَ رَجُلًا يُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ تُحَرَّقُ بُيُوتٌ على من فيها). واته: له خوولیامدا بوو فەرمان بكەم به گەنجەكان كه چاڕۆكه دارم بۆ ئاماده بكەن، پاشان فەرمان بكەم بەكەسێك پیشنوێژی بۆ خەڵك بكات، پاشان ماڵەكان بسوتێنرێت بەسەر ئەوكەسەی كه تێدایه.

لەم فەرموودەیەو ئایەتەكەی پێشودا ئاماژه بەهەڕەشەیەكی توند دەكات بۆ ئەوكەسەی كه واز له نوێژی بەكۆمەڵ دەهێنێت بەبێ هیچ پاساو و بیانوویەك.

ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووه كه پیاوێكی كوێر هاته خزمەتی پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا كەسێكم نیه بمهێنێت بۆ مزگەوت، ئایه دەتوانم له ماڵەوه نوێژەكەم ئەنجام بدەم؟ ڕیگەی پێدا، كاتێك كەپشتی تێكرد بانگی كرد و فەرمووی: (هل تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ ؟ فقال: نعم، قال: فَأَجِبْ)[1]. واته: ئایه گوێت له بانگ دەبێت ؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: كەواته دەبێ بچیت بەدەمیەوه.

(ابن مسعود) دەڵێت: ئەوەی حەز دەكات بگات بەخوای گەوره به موسڵمانی با پارێزگاری له پێنج فەرزەی نوێژ بكات كاتێك كه بانگ دەدرێت بۆ نوێژی جەماعەت، چونكه خوای گەوره دایناوه بۆ پێغەمبەرەكەمان. جا ئەگەر ئێوه لەماڵەوه نوێژەكانتان بكەن، ئەوه وازتان له ڕیگەی پێغەمبەر هێناوه، ئەگەر واز له ڕێگەی ئەو بهێنن، ئەوه گومڕا دەبن، ئەوەی له سەردەمی ئێمەدا نەدەهات بۆ نوێژی بەكۆمەڵ ئیللا دووڕووی ڕاستەقینه یا نەخۆش بوو، كەسی وا هەبوو نەیدەتوانی بێت دووكەس دەچوونه ژێر باڵی تا

---

[1] – مسلم(٦٥٣).

ئامادەی نوێژی بەكۆمەڵ بێت، ئەمەش بەهۆی سوور بوونیەوە بوو لەسەر پاداشتەكەی و ترسان لە سزای وازهێنان لە نوێژی جەماعەت بوو[١].

## بـەش

فەزڵی نوێژی بەكۆمەڵ گەورەیە وەك لە ڕاڤەی ئەم دەقەی قورئاندا هاتووە:﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ﴾(الأنبياء ١٠٥). واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە لە كتێبی زەبووردا دوای تەورات بڕیارمان داوە كە: بێگومان بەندە شیاو و چاكەكانم دەبنە خاوەنی زەوی.

لەڕاستیدا ئەوانە ئەوكەسانەن كە پێنج فەرزەكە بەكۆمەڵ نوێژ دەكەن.

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ﴾( يس: ١٢ ). واتە :هەرچی كردوویانە و دەیكەن تۆماری دەكەین لەگەڵ ئاسەوارەكانیشیاندا.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (من تَطَهَّرَ في بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إلى بَيْتٍ من بُيُوتِ اللَّهِ لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً من فَرَائِضِ اللَّهِ كانت خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً وَالْأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً)[١]. واتە: هەركەسێك خۆی بشۆرێت لە ماڵەوە پاشان بچێت بۆ ماڵێك لە ماڵەكانی خوای گەورە بۆ بەجێهێنانی فەرزێك لە فەرزەكانی پەروەردگار، ئەوە هەر دوو هەنگاوی یەكەمیان كە دەینێت تاوانێكی لەسەر دەسڕێتەوە، هەنگاوەكەی تری پلەیەك بەرز دەبێتەوە.

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ألا أَدُلُّكُمْ على ما يَمْحُو الله بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ ؟ قالوا: بَلَى يا رَسُولَ اللَّهِ، قال: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ على الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إلى الْمَسَاجِدِ وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ فَذَلِكُمْ الرِّبَاطُ)[٢]. واتە: ئایا هەواڵتان پێبدەم كە چی

---

[١] – مسلم(٦٥٤ \ ٢٥٧).

[١] – البخاري(٦٤٧)، ومسلم(٦٦٦).

[٢] – مسلم(٢٥١).

شتێك هەڵەكان دەسڕێتەوەو، پلە بەرز دەكاتەوە ؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دەستنوێژ بە تەواوی لەوكاتەی كە دونیا زۆر ساردە، زۆر هەنگاونان بۆ مزگەوت، چاوەڕوانی نوێژ دوای نوێژ بەڕاستی ئەوە وەك پاسەوانی وایە لە سەنگەردا لە پێناو خوای گەورەدا.

# تاوانی شەست و حەوت

## زیان گەیاندن لە وەسیەتدا

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴾( النساء: ١٢) . واتە :ئەمانەش دوای جێبەجێکردنی وەسیەتی ئێوە و دانەوەی قەرزتان ، بەبێ ئەوەی بچێتە چوارچێوەی زەرەر دان لە میرات، وەك ئەوەی وەسیەتێك بکات بەدانی قەرزێك کە قەرزار نیە، مەبەستی ئەوە بێت زەرەر بدات لە میراتگرەکە، خوای گەورە ئەمەی قەدەغە کردووە. (ابن عباس) دەربارەی: ﴿وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴾. دەڵێت: مەبەستی ئەوەیە کە خوای گەورە حەلاڵی کردووە لە فەرائزدا لە ماڵی بەجێماوو میرات.﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾ لە دابەش کردنی میراتی دا ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدٗا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾ (النساء: ١٣ – ١٤). واتە: جا ئەوکەسەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە خوا دەیخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی گەورەو دەسکەوتی بێ سنوور. ( بەلاَم ) ئەوەی یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و دەرچێت لە سنوورەکانی، ئەوە خوا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کە بۆ هەمیشە تیایدا دەمێنێتەوە و سزایەکی سەرشۆڕکەر و ڕیسواکەری بۆ هەیە.

موجاهید دەڵێت: مەبەست ئەوەیە کە خوای گەورە فەرزی کردووە لە میراتدا.

(عکرمة) لە (ابن عباس) وە دەڵێت: ئەوەی ڕازی نەبێت بە دابەشکردنی خوای گەورە و سنوور ببەزێنێت دەیخاتە دۆزەخەوە.

(الكلبي) دەڵێت: واتە: بێ باوەڕی بکات بەرامبەر دابەشکردنی خوای گەورە لە میراتدا، سنوور ببەزێنێت و حەڵاڵی بکات بۆ خۆی، ئەوە دەیخاتە دۆزەخەوەو سزای بە ئێشی دەدات.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ اللَّهَ قد أعْطَى كُلَّ ذِي حَقّ حَقَّهُ فلا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ)[1]. واتە: بەڕاستی خوای گەورە مافی هەموو خاوەن حەقێکی داوە، کەواتە میراتگر بۆی نیە وەسیەت بکات.

[1] – أبو داود(٣٥٦٥)، والترمذي(٢١٢٠)، وقال: (( حديث حسن صحيح))، وصححه الشيخ الألباني.

# تـاوانی شەست و هەشت

## فێڵ کردن

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ ﴾(فاطر: ٤٣). واتە: پیلانی شەڕ و تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کە نەخشەی بۆ دەکێشن.

خوای گەورە دەربارەی دووڕووەکان دەفەرموێت: ﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ ﴾( النساء:١٤٢). واتە: بەڕاستی دووڕووەکان ( وادەزانن ) فێڵ لەخوا دەکەن ( لە کاتێکدا ) ئەو زاتە فێڵەکانیان پووچ دەکاتەوە.

(الواحدي) دەڵێت: بەشێوەیەك کردار دەکەن وەك کەسێك کە بیەوێت خوای گەورە بخەڵەتێنێت، بەو شێوەیە نوورو ڕووناکیان پێ دەدرێت وەك چۆن موسڵمانان نوور و ڕووناکیان پێ دەدرێت، بەڵام هەرکە دەکەونە سەر پردی (الصراط)، ڕووناکییەکەیان دەکوژێتەوەو لە تاریکیدا دەمێننەوە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (وَأَهْلُ النَّارِ خَمْسَةٌ) وذكر منهم (وَرَجُلٌ لَا يُصْبِحُ ولا يُمْسِي إلا وهو يُخَادِعُكَ عن أَهْلِكَ وَمَالِكَ). واتە: ئەهلی ئاگر پێنج تاقمن، (( لەوانە )) پیاوێکە ڕۆژو شەوناکاتەوە ئیللا فێڵت لێدەکات لەسامان و ماڵ و منداڵتدا.

# تاوانی شەست و نۆ

## ئەوکەسەی سیخوڕی بەسەر موسڵمانانەوە دەکات و بەدوای عەیب و عاریاندا دەگەڕێت

فەرموودەی (حاطب بن أبي بلتعة) دەربارەی ئەوە هاتووە[١].

ئیمامی (عمر) ویستی لەسەر ئەو کردارەی بیکوژێت، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ بەرهەڵستی لێکرد چونکە ئەو بەشداری جەنگی بەدری کردووە.

ئەگەر سیخووڕی کردنەکەی بوو بە هۆی لاواز کردنی ئیسلام و موسڵمانان و کوشتار و تالآنی بەدوای خۆیدا هێنا، ئەوە فەسادی لەسەر زەویدا درووست کردووە، هەر بۆیە دەبێت بکوژرێت سزای لەسەر جێبەجێ دەکرێت.

جا ئەگەر قسە هاوردن و بردن (النميمة) لە تاوانە گەورەکان بێت، ئەوا سیخووڕی وجاسوسی کردن زۆر لەوە گەورەترە.

---

١ — البخاري(٣٠٠٧)، ومسلم(٢٤٩٤).

# تاوانی حەفتا

## جنێو و تانەدان بە هاوەڵەکانی پێغەمبەر

( أبو هريرة ) دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی: خوای گەورە دەفەرموێت: (من عَادَى لي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ)[٣]. واتە: هەرکەس دوژمنایەتی دۆست و ( ولي ) یەکی من بکات، ئەوە جەنگ لەدژی بەرپا دەکەم.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي فلوا أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا ما بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ ولا نَصِيفَهُ)[٢]. واتە: جنێو بە هاوەڵەکانم مەدەن، لە ڕاستیدا ئەگەر کەسێك لە ئێوە بە قەد کێوی ( أحد ) ئاڵتوون ببەخشێ نەدەگاتە مشتی یەکێکیان و نەدەگاتە نیوەی.

پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (آيَةُ الْإِيمَانِ حُبُّ الْأَنْصَارِ وَآيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ الْأَنْصَارِ)[٣]. واتە: نیشانەی ئیمان خۆشویستنی پشتیوانانە، نیشانەی دووڕوویش( نیفاق) ڕقبونە لێیان

ئەمەش بەهۆی ئەوەوە بووە کە لە پێشینەوە لەخزمەت پێغەمبەری خوادا بوون و جیهادیان کردووە.

کەسێك فەزڵ و ڕێزی هاوەڵان دەزانێت کە بەجوانی لە ژیانی ئەوان تێگەیشتبێ، لەخزمەتی پێغەمبەری خواداﷺ بێ و دوای مردنیشی: لە کێبڕکێکردندا بوون لە ئیمان و

---

[٣] – البخاري(٦٥٠٢).

[٢] – البخاري(٣٦٧٣)، ومسلم(٤٠٢٥).

[٣] – البخاري(٣٧٨٤)، ومسلم(٧٨).

باوەڕدا و، دژایەتی بێباوەڕان، بڵاوکردنەوەی ئایین و، دەرخستنی دروشمی ئیسلام، بەرز ڕاگرتنی وتەی خواو پێغەمبەرەکەی و، فێربوونی بنەماو سوونەتەکانی.

ئەگەر ئەوان نەبوونایە ئەوە نە بناغەی(أصل) ئایینی ئیسلاممان دەزانی، نە لق وبەشەکانی (فرع) و نە فەرز سوونەتمان دەزانی.

هەرکەسێك تانە و جنێویان پێ بدات، ئەوە لە دین دەردەچێت و، لە میللەتی ئیسلام بەری دەبێ، چونکە تانەدان تەنها لە عەقیدەو بیرو باوەڕو ڕقێکی دوژمنکارانەوە سەرچاوە دەگرێت، وە ئینکاری لەوە دەکات کە خوای گەورە وەسفی کردوون، بەهەمان شێوە پیغەمبەریشﷺ باس لە فەزڵ و ڕێزی ئەوان دەکات و خۆشیانی دەوێت، چونکە ئەوان باشترین هۆ بوون لە گێڕانەوەدا ، باشترین گەیەنەر بوون لە لە پەیامەکەدا، بۆیە تانەدان لە گەیەنەر تانەدانە لە گەیەنراو، ڕق لێبونەوە و گاڵتە پێ کردن بە گەیەنەر، ڕق لێبونەوەو گاڵتە پێ کردنە بە گەیەنراو، ئەمە گومانی تێدا نیە بۆ کەسێك کە بیەوێت بیر بکاتەوەو تێڕابمێنی و، بێگرد بێت لە نیفاق و زەندەقە و گومڕایی و بێ بڕوایی لە بیرو باوەڕەکەیدا.

پێویستە لەسەر موسڵمان خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی خۆش بوێت، ئەو پەیامەیش کە لەلایەن ئەوەوە هاتووە، ئەوەی کەهەڵدەستێ بەجێبەجێکردنی و کار بە سوونەتەکەی دەکات، وە خۆشەویستی هاوەڵەکانی و پێغەمبەرو خێزان و منداڵەکانی و خزمەتکارەکانی،هەروەها خۆشویستنی ئەوەی کە خۆشیانی دەوێت، ڕق لێبوون لەوەی کە ڕقی لێیان دەبێت.

(أيوب)ی (السختياني) دەڵێت: ئەوەی (ابوبكر)ی خۆش بوێت ئەوە ڕووناکی دینی ڕاگرتووە، وە ئەوەی ئیمامی (عمر)ی خۆش بوێت ئەوە ڕێگەی دینی دۆزیوەتەوە، ئەوەی ئیمامی (عثمان) خۆش بوێت ئەوە سوودی لە نووری خوا وەرگرتووە، و ئەوەی ئیمامی

(علي) خۆش بوێت ئەوە دەستی گرتووە بە قورئانی پیرۆزەوە، وە ئەوەی وتەی باش بڵێت دەربارەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ ئەوە بەتەواوی دوورە لە نیفاق و دووڕوویی.

## بـەش

چاکەو فەزڵ و ڕێزی هاوەڵان لەوە زۆرترە کە باس بکرێت، زانایانی سوننە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە باشترین هاوەڵان دە هاوەڵە مژدە پێدراوەکەیە (العشرة المبشرة) وە باشترینی ئەو دە هاوەڵە: (ابو بکر الصدیق)، پاشان (عمر )ی کوڕی(الخطاب) پاشان (عثمان)ی کوڕی(عفان)، پاشان (علي)ی کوڕی(أبي طالب)،- ڕەزای خوا لە هەموویان بێت -، کەس گومانی لەمەدا نیە ئیللا داهێنەرێکی دووڕووی پیس نەبێت.

(الخلفاء الراشدین) بریتین لە: (ابو بکر، عمر، عثمان،علي)، - ڕەزای خوا لە هەموویان بێت-، خوای گەورە دەربارەی فەزڵی (ابو بکر) چەندین ئایەتی دابەزاندووە، خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُواْ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓاْ أُوْلِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ ﴾(النور: ٢٢). واتە: ئەوانەی کە خاوەن سامان و بەخشندەیین لە ئێوە با سوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران لە پێناوی خوادا نەدەن.

جیاوازی لە نێوان زانایاندا نیە کە دەربارەی (ابو بکر) دابەزیووە، بۆیە بە (فضل) وەسفی کردووە، خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ ﴾(التوبة: ٤٠). واتە: یەکێك بوو لەو دووکەسە کاتێك هەردووکیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بوون.

بەهەمان شێوە جیاوازی نیە لە نێوان زانایاندا کە ئەم دەقەش لەسەر (ابو بکر )دابەزیوە، خوای گەورە شایەتی لەسەر هاوڕێیەتی پێغەمبەر داوە و مژدەی ئارامی پێداوە.

ئیمامی (عمر) دەڵێت: کێ لە (ابو بکر) فەزڵی زیاترە کە خوای گەورە بە(ثاني أثنين) وەسفی کردووە و خوای گەورە سێیەمیانە؟

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾(الزمر: ٣٣). واتە: ئەوکەسەش ڕاستی و حەقیقەتی هێناوەو باوەڕیشی پێیەتی، تەنها ئا ئەوانن خواناس و دینداران.

(جعفر الصادق) دەڵێت: گومان و جیاوازی لە نێوان زانایاندا نیە ئەوە کە هاتووە بە ڕاستی ﴿ جَآءَ بِٱلصِّدْقِ ﴾ پێغەمبەری خوایە وە ئەوەی بەڕاستی زانیوە ﴿ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ﴾ ئەوە (ابو بکر)ە -ڕەزای خوای لێ بێت -، چی لەمە باشترو ڕەوانبێژترە دەربارەی هاوەڵان -ڕەزای خوایان لێ بێت-.

تەواو بو بە پشتیوانی خوای گەورە

# ناوەڕۆك

# تاوانە گەورەکان

نووسینی
ئیمامی زەهەبیی

وەرگێرانی
عبّاس محمّد أمين

نارین

له ڕاستیدا کتێبی تاوانەگەورەکان (الکبائر) سوودمەندە بۆ وتاربێژان ئامۆژگاریکەرانو ئاگەدارکردنەوەیەکە بۆ بێ ئاگایانو دوودڵان، سەرکۆنەکردنە بۆ سەرپێچیکەرانو لە سنوور دەرچووان، ڕێنیشاندەرە بۆ خوو ڕەوشتی جوانو بەرز ڕاگرتنی، بەتایبەت خاوەنی ئەم کتێبە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، چارەسەری هەندێ بابەتی تێدا کردووە کە سوودمەندە بۆ دنیاو دوارۆژیان، قسەی لەسەر هەندێ بابەت کردووە کە تێگەشتن لێی گرانە لە کتێبە زانستی و بابەتیەکاندا بە تایبەت بۆ زانا و خوێندکاران بە گشتی.

**لە پێشەکی لیکۆڵەر وەرگیراوە**

نارین